# کاروان

گۆڤارێکی ڕۆشنبیری ی مانگانەیە

ئەمینداریتی ی گشتی ی ڕۆشنبیری و لاوان

بەزمانی کوردی و عەرەبی دەری دەکا

22 تەمووزی 1984 ساڵی دووەم

## لەم ژمارەیەدا



سەرنووسەر
محمد امین محمد احمد

●

جێگری سەرنووسەر
حسین عارف

●

سکرتێری نووسین
سەردار حمید میران

●

دەستەی نووسەران
حسین رەشوانی
دکتۆر شکریە رسول
زبیر بلال اسماعیل
جلال مدحت خۆشناو
ناصر یوسف
فیصل مصطفی

●

دەرهێنانی هونەری
محمد زادە

●

سەرپەرشتی چاپ
جعفر بەرزنجی

ئەدرەس : هەولێر ـ ئەمینداریتی گشتی ڕۆشنبیری و لاوان ـ گۆڤاری (کاروان) ت 20882

م . ج . ڕۆژ بەیانی

# مێژووی حەلوان

بەشی دووەمو
کۆتایی

لەم سەردەمەدا « هیلالی کوڕی بەدر » لە زیندانی « سولطان الدەولەی کوری بەهاء الدەولە بوەیهی پادشای بەغداد – دا بەندیبو ، طاهیری کوڕیشی لەشەڕدابوو لە گەڵ « عەمید الجیوش » ی سەرداری سپای فەخر المولکی وەزیری سلطان الدەولە ، کە « بەری » شارەزوری بۆ تەرك كردبوون و ، طاهیر لێی وەرگرتنەوە . هەر کە « بەدر » کوژرا طاهیری کوڕەزای هەڵی کوتایە سەر وولاتەکەی « بەدری باپیری » و لە گەڵ « شمس الدولە » دا کەوتە شەڕەوە ، بەڵام شکستی خواردو بەدیل گیراو گەنجینەو دارایەکەی بە تالانی بردرا بۆ « هەمەدان » و عێلەکانی « لوڕ » و شازەنجانی (شازەنگانی) چونە لای « حیسام الدولە ئەبولشەوك کوری عەییار » ی ئەمیری « حەلەوان » هەرکە « سولطان الدولە » بەمەی زانی گورج هیلالی لە زیندان دەرکردو سپاییکی خستە تەکی و ناردی بۆ ئەوەی وولاتەکەی باوکی لە ژێر دەست « شمس الدولە » دەربهێنێتەوە ، ئەوەبوو لەگەڵ « شمس الدولە » کەوتە شەڕەوەو لە « کچی القەعیدە » ی هەمان ساڵدا شکستی خواردو بەدیل گیراو کوژرا[50]

نووسەری « موجمەل التەواریخ » کە نە ناسراوەو لە 520 کۆچی . ئەم کتێبەی داناوەو ، « مەلیك الشوعەراء بەهار » پەراوێزی لێ کردووەو هەڵەکانی ڕاستکردوتەوەو بە چاپی گەیاندووە ، ئەم نووسەرە لە باسی بنەماڵەی « حەسەنوەیهی » دا نووسیویە :

« بەدر کوری حەسەنوەیهی » شاڵاوی بردۆتە سەر « خۆشین کوری مەسعود » کە لە قەڵای « گۆشخد » ی کناری « سپید رود » دابووەوە « شەمس الدولە » ی فەرمانڕەوای « هەمەدان » ویستی بچێت بۆ یارمەتی ، کە سرنجیدا « بەدر » بەسەر « خوشین » دا زاڵبووە گەڕاوەتەوە[50] .

وادیارە خۆرەڵاتناسی مەزن « مینورسکی » ئەم کتێبەی بەرچاو کەوتووە (کە نووسرانی دەکەوێتە پێش نووسرانی ئەلکامیل ئیبن الئەثیرەوە ، بۆیە لە کتێبی گۆرانەکەیا – کە بە ئینگلیزی نووسیبووی و لە کاتی خۆیا مامۆستا ناجی عەبباس وەری گێڕا بە کوردی و لە ژمارەکانی گەلاوێژا بڵاوی کردەوە) – وای بۆ دەرکەوتووە کە دەبێ کۆسجەد – یاگوشخەد – کۆسەی هەجیجی هۆرامان بێت و « سپید رود » یش « سیروان » بێ و « جوڕەقان » یش گۆران بێ . بۆیە لەم بارەوە ، لە ناوچەی « هۆرامان » دا بەدوای شوێنەواری زۆر قەڵای کۆندا گەڕاوەو باشترین خزمەتی بە مێژووی کورد کردووە .

بەڵام وەك لە قسەکانی ئیبن الئەثیر بۆمان دەرئەکەوێ ئەو بەهەڵەدا چووە . شەڕەکەی بەدرو حوسەینی کوڕی مەسعود لە هەرێمی « شارەزور » دا نەبووەو نزیك بە هەمەدان بووە . « بەدر » لەو حەڵەدا شارەزووری سپاردبوو بە « عەمید الجیوش » ی سەردار سپای (فەخر الملك) ی وەزیری سولطان الدولەی پادشای بەغدا ، ئەوەبوو طاهری کوڕەزای بەدر بەمە قایل نەبووبوو لەگەڵ « عەمید

الجیوش » دا له شەڕابوو ... ئەمە بۆمان دەرەخات کە « کوسەجەد » لە هەرێمی سەر بەشارەزوردا نەبووەو لە هەرێمێکی نزیك بە « هەمەدان » دابووە ، کە تیرەی « جورقان » پاش کوشتنی « بەدر » فریاکەوتوون پەناە بەرنە میری « هەمەدان » . بۆیە من گومانم وایە کە « کوسەجەد » « سەقزی » ئێستەیەو « جورقان » یش « گەورکان » ـ کە عەرەب کردویانە بە « جورقان » و « گۆان » نی‌یە کە دەکا « جوران » . جگە لەوەیش هیچ قەلایێکی تری هەرێمی « هۆرامان » ـ یا وڵاتی ئەردەلانی پاش ئەوان پەیدابوو ـ لە قەڵەمڕەوی دەسەڵاتی حەسەنوەیهی‌دا ناوی نەهاتووە ، وا دیارە ئەوان لەبەری خۆرئاوای روباری « سیروان » دا ، جگە لە هەرێمی شارەزۆر ، بەلای باکوڕ یاهیچ جێگەیێکیان بەدەستەوە نەبووە ، تەنیا بەرەو باشوری شارەزوورو بەلای خۆرئاوایا پەرەیان سەندووە .

ساڵی 406 کو . « شەمس الدەولە ئال بویە » (بوەیهی) طاهیری کوڕی هیلالی کوڕی بەدری لە زیندان کرد ، بەو پەیمانەی جارێکی‌تری یاخی نەبێ‌و لە قسەی دەرنەچێ « طاهیر » هەرکە ئازاد بوو ، ئەمجارە بەیارمەتی هەندێ عێل‌و خێل لەگەڵ « ئەبوالشەوك عەییاری » کەوتە شەڕەوەو شکاندی‌و ڕەتاندی‌و سەعدی برای کوشت . ئەبوالشەوك گەڕایەوە بەرەو « حەلەوان » « ئەبوالحەسەن کوڕی میزیەدی ئەسەدی » ـ کە لەسەر دارانی حیللەبوو ـ بەڵێنی یارمەتی‌و پشتیوانی لێکردنی دایی ، بەلام « ئەبوالشەوك » زاتی ئەوەی نەبوو کە لەگەڵی بکەوێتە شەڕەوە . « طاهیر » لە « نەهرەوان » لەشکر بەزی کردو لەگەڵ ئەبو الشوك » ئاشتەوەبوو خوشکەکەشی خواست‌و بەمە لێی دڵنیابوو کە ئیتر شەڕ لە نێوانیان‌دا ڕونادا .. . بەلام « ئەبوالشوك » لە دەرفەتێکا هێرشی بردە سەری‌و لە تۆڵەی « سەعدی » برایا کوشتی ، پاش ئەوە یارو یاوەرانی « طاهیر تەرمەکەیان بردە بەغدا لە « باب التبن » ناشتیان[60] .

لەم ڕۆژە بە دواوە ، بنەماڵەی « حەسەن وەیهی » لاوازو بێ‌هێز بوون‌و ڕوخان‌و بنەماڵەی عەییاری هێزیان سەندوجێی ئەوانیان گرتەوە . وەك لەمەودووا دەرئەکەوێ .

ساڵی 432 کو . « حەلەوان » کەوتە ژێر دەسەڵاتی حیسام الدەولە ئەبوالشەوك محەمەد کوڕی عەییارو هەر لەم ساڵەدا « سەعدی » ی کوڕی بەهێزێکەوە نارد بۆ داگیرکردنی « دەقوقا » (طاوغ) ، سەعدی توانی « دەقوقا » لە چنگی ئەبو الماجید موهەلهەلی » مامی دەربێنی . بەلام تووشی شەڕێکی سەخت بوو . ناچار خود « ئەبوالشەوك » چووە هاواریەوەو « دەقوقا » ی گەمارۆداو دژو سەنگەرەکانی وێران کردو سپاکەشی بەشی زۆری شارەکەیان تالان کردو چەك‌و تفاقی کوردەکانی ئەو ناوەیان هەموو بەتالان‌برد . بەلام حیسام الدەولە ئەبوالشەوك تەنیا یەك شەو لە (دەقوقا) مایەوەو زۆر بەپەلە بەرەو « حەلەوان » گەڕایەوە چونکە هەوالی بۆهاتبوو کە « سورخاب » (زوراب) ی برای لەگەل « ئەبوالفەتح کوڕی وەڕام جاوانی » و عێلی جاوان‌دا پەیمانی بەستووەو هەندێ لە هەرێمەکانی ژێر دەستی ئەویان داگیر کردووە[61] ، ئینجا « ئەبو الماجید موهەلهەل » پەنای بردە بەر « علاء الدین » کاکۆیەی میری هەمەدان‌و داوای لێکرد یارمەتی بدات « علاء الدولە » بەسپاییکەوە کەوتە تەکی‌و شالاوی کردە سەر هەرێمەکانی ژێر دەستی « ئەبوالشەوك » و هەرکە ئەوان گەیشتنە قرمسین (کرماشان) ئەبوالشەوك بەرەو حەلەوان گەڕایەوە ، ئەوان کەوتنە دوای تا « بورج القەلعە » ـ کە ئەمرۆ پێی ئەوترێ « سورخەدزە » و ـ « ئەبوالشەوك » روی کردە دژی « سیروان[62] » و خۆی پەنادا[63] . ئەوەی راستی‌بێ ئەم شەڕانەی ئەبوالشەوك هەڵی گیرساندوە هەموو بۆ رزگارکردنی « ئەبوالفەتحی » کوڕی‌بو کە لەلای « ئەبوالماجید موهەلهەلی » برای دیل‌بوو . بەلام سەرنەکەوت‌و بەمراز نەگەیشت .

ساڵی 434 کو . « ئەبوالشەوك شالاوی کردەسەر « شارەزوور » و ئەو هەرێمەی تالان کردو دێهاتەکانی سەراسەر ئاگر تێبەرداو دژی « تیران شاه »[64] ی گەمارۆدا . بەلام « ئەبوالقاسم کوری عەییاض » بەرگری لێکردو بەو بەلێنەی هەول بدات « ئەبوالفەتح » ی کوڕی لە زیندانی « موهەلهەل » رزگار بکات لە هەرێمەکە دووری خستەوە . « موهەهەل » لەم کاتەدا « شارەزووی بەجێ هێشت‌و روی کردە « سندە »[65] شارەکانی‌تری ژێر دەستی « ئەبوالشەوك » و هەمووی ئاگر تێبەرداو بەهەردولا ، بەدبەختی‌و رۆژە ڕەشی‌یان بۆ گەلە کوردەکە هێنا . ئینجا

« ئەبوالشەوك » نامەییکی جۆ « ئەبوالقاسم کورد عەییاضی » نـووسیو داوای لیٚکرد کـە بەلٚێنـەکەی خـۆی بەجێ بهێنیٚو « ئەبوالفەتح » ی کوڕی بۆ بەربدات . بەلام « ئەبوالقاسم » لە وەرامیدا نووسی کە « موهەلهەل » تکای نەگرتووەو بەقسەی نـەکردووەو کـوڕەکەی بـەرنەداوە . ئنجـا ئەبـوالشـەوك لە (حەلەوان) ەوە ڕوی کردە « صامغان»[66] وهەموو هەرێمەکەی ژێر دەستی (موهەلهەل) ی تالان کردو ئاگری تیٚبەردا[67] .

سالی 435 کو . « جەلال الدەولە ئەبو طاهیر کوڕی بەهاء الدەولە کوری عەضدالدەولە ئال بـویە » مـرد ، ئەبـوکالیجـار کوری « سولطان » الدەولة کوڕی بەهاء الدەولە » ی برازای بوو بە سولطانی بەغداو « مەلیك عەزیز ئەبومەنصوری کوڕی جەلال الدەولە » کە زاوای « ئەبوالشەوك عـەییاربـو ـ پەنـای بردە « حەلەوان » بەلام « ئەبوالشەوك » ی خەزووری ڕیی نەداو ناچاری کرد کچەکەشی طەلاق بدات[68]

سالی 437 ك « ئیبراهیم یەننال برای سولطان طوغـرول بەگی سەلجوقی » بەفەرمانی طوغرولی برای بە لەشکرەوە ڕوی کردە وولاتی چیاو لەسەرەتادا « هـەمەدان » ی داگـیر کردو « گرشاسف کوری عەلاء الدەولە کاکویە » هەلاتو خۆی دایە پـەنـای کـوردانی گـەورك (جـورقـان) « حیسـام الدەولە ئەبوالشەوك عەییاری » کە لەوکاتەدا لە « دینەوەر » بو رووی کـردە « قرمیسـین » (کرمـاشـان) ، و یـەلامـال دینـەوەری باگیرکردو بەرەو قرمیسین کشا . ئەم جارە « ئەبـوالشەوك » هێزێکی لەوێ بەجیٚهێشت تێکـەل لە کوردو دەیلەمو خـۆی چووبۆ « حەلەوان » .. بەلام زۆری نـەبرد « یـەننال » ئـەو ناوەی داگیر کردو ڕوی کردە « حەلەوان » جا « ئەبوالشەوك » حـەلەوانی چـۆل کـردو پـەنـای بـردە دژی « سیـروان » و « ئیبراهیم یەننال » هاتـە ناو « حـەلەوان » ەوەو شارەکـەو کۆشکی فەرمانڕەوایی ئەبوالشەوکی ئاگر تێبەرداو ، هـەرلەم سـالەدا » ئەبـوالشـەوك » لە دژی سیـروان دامـردو لەوێ نێژرا[69] .

سالی 438 کو . « بەدر کوڕی طاهیر کوڕی هیلال کوڕی بەدری کوڕی حەسەنوەیهی » ـ کە ئـاخرین سـەرداری بنە مالەی حەسەنوەیهی بوو ، توانی بەپشتیوانیی « ئیبـراهیم یەننالی سەلجوقی » « حەلەوان » بخاتە ژێردەستی خۆیەوە ، بەلام زۆری نەبرد کە « ئەبوالماجید موهەلهەل » ڕووی کردە « مـایدەشت » و لەوێـوە کەوتـە ڕیٚوجما بـەرەو کرمـاشان « هەرکە « بەدر » بەمەی زانی هەرێمـەکەی بـەجیٚهێشتو « موهەلهەل » هەمووی داگیر کردەوەوە محەمەدی کوڕی نارد بۆ « دینەوەر » و خۆی لەگەل سپـاو هێزەکـانی « یەننـال »

کـەوتـە شـەڕەوەو یـارو یـاوەرانی « یـەننـال » هـەلاتنو « محەمەد » دینەوەری وەرگرتەوە . بەلام بەو هۆیەوە کەلەم سەردەمەدا « موهەلهەل » بیوەژنەکەی ئەبوالشـەوکی برای خۆیی خواستبو ـ کە دایکی سەعدی ئەبوالشەوك بو ـ وەلەم ڕووەوە دەربـارەی عێـلی شـازەنگـانی کـەم هـاوڕو کـەم لاوانـدنبوو ، « سـەعـدی » لەگـەل « ئیبـراهیم یـەننـال » ڕیـككەوتو بـەهێزی عێـلی شازەنگـانی خـالوانییـەوەو بـە لەشکـریکی تورکی غـوزەوە کە یـەننـال نـاردبـوی ، بـەرەو « حـەلەوان » شالاوی بـردو داگیـری کـردو چـەنـد ڕۆژی تیامایەوە ، ئنجا گەڕایەوە بەرەو « مایدەشت » و لەم هەلەدا « موهەلهەل » ی مامی حـەلەوانی بەجیٚهێشتو ڕوی کـردە « بەڕولە » (بەللوط) و « سەعدی » حەلەوانی داگیر کردەوەو پاش ئەمە « بەندەنیجین » (مەندەلی) دایە « ئەبوالفەتح کوڕی وەڕام جاوانی » و بەیارمەتی ئەو بەهێزێکی غوزی تـورکەوە شالاوی بردە سەر « سورخاب کوڕی محەمەد کوڕی عەییار » (مامی) و مەبەستی ئەوەبو کە لە قەلای « دز دیلویە » دا (کە ئـەبێ قەلای دزلی بێ) گـەمـاروی بـدات بـەلام کـەنـزیکی « دزدیلویە » بوونەوە ڕیگەکەیان بەناو دەربەندیکی تەنگەبەردا تێئەپەڕیو بێ ئەوەی گوێی بدەنێ پێشکەوتن « سورخاب » پەلێ چەك بەدەسی کوردی ، لە دەربەندەکە دامەزراندبوو ، هە کە گەیینە ناو دەربەندەکەو لەوانەبوون کە تیبریان پیٚبگـات « سورخاب » لەقەلاکەی هاتە خوارەوەو لەگەلیان کەوتەشەڕو تەنگە تاوی کردن ، کە بەرەو دووا کشانەوە ، هێزەکەی نـاو دەربەندەکە لیٚیان ڕاپـەرینو پشتیان لیٚگـرتنو تیرەبـارانیان کـردن . ناچـار خۆیـاندا بـەدەستـەوە ملیـان دانـەوانـد . « سەعدی ئەبوالفەتح وەڕام » و سەرانی سپا هەموو بەدیل گیران بەم جۆرە هێزی تورکی غوزو سپا کوردەکەیان سەریان لیٚ تێكچوو پەشتەی یەکێتییان پچڕاو بلاوبوونەوە[70] .

سالی 439 کو . کوردە لوڕەکانو سپاکەی « سورخاب » لە تاو بەدڕەفتاریی « سورخاب » بەتـەنگ هـاتنو زانییان کـە

« ئیبراهیم یەننال » یش لەو کوشتارەی کە لە غوزەکان کردبوی زۆر دڵگیربوبو ـ لە ناکاو « سورخاب » یان دەستگیر کردو بردیانە بەردەست « یەننال » و چاوێکی دەرکردو داوای لێ ی کرد « سەعدی » لە زیندان بەرەلابکات ، بەلام « سورخاب » بەڵێنی نەدا ، ئەبوالعەسکەری کوڕی کەوتەڕێ بەرەو قەلاکەو لەوێ « سەعدی » رزگار کردو داواشی لێکرد کە تکا لە « ئیبراهیم یەننال » بکات سورخابی باوکی ئازاد بکات . سەعدی لەگەڵ دەستەیێ پیاو ماقوڵی کورد دا چووە لای « یەننال » و داوای لێکرد « سورخاب » بەر بدات « یەننال تکای نەگرت ، لەبەر ئەوە سەعدی دڵگیربوو گەڕایەوە بۆ « دەسکەرە »[71] و زۆری نەبرد « ئیبراهیم یەننال » شالاوی کردە سەر دژی کنکور « کەنگاوەر » و پاش شەڕو هەراییکی سەخت لە دەست « عەکبەری کوڕی فارس » ی دەرهێنا ـ کە ئەم « عەکبەرە » سەر بەگرشاسف کوڕی عەلاء الدەولە کاکویە » بو ، « وەعەکبەر » پاش ئەوە پەنای بردە قەلای « سەرماج » کە بەدەست یەکێ لە بنەماڵەی « بەدری کوڕی حەسەنوەیهی » یەوەبوو ـ کە دەبێ مەبەستی « بەدری کوڕی طاهیر » بێ ـ ئینجا « یەننال » لەشکرێکی خستە ژێر دەستی « ئەحمەد کوری طاهیری زاوای کە (وەزیر) یشی بو جا ئەم ئەحمەدەی بەلەشکرەوە بەڕێ خستو « سورخاب کوڕی محەمەد کوڕی عەییار » یشی لەگەل ناردو بەهۆی ئەوەوە هەموو دژو قەلاکانی ژێر دەستی ئەوی داگیرکردو لەسەرە تادا ڕویان کردە قەلای « کەلەکان » ـ کە ئیستەش هەر ناوی (کەلەکن) ە ـ ئەم قەلایە خۆی نەدا بەدەستەوە ، ئینجا ڕویان کردە « دز دیلویە » و گەمارۆیان داو بەشێ لە هێزەکەشیان بەرەو « بەندەنیجین » خستەڕێو هەندێکیشی شالاوی کردە سەر « ئەبوالفەتح کوڕی وەڕام » ئینجا لە مانگی « رەجەب » ی هەمان سالا تورکە غوزەکان دو فەرسەنگ لە ژور « باجسرە » وە بەشەبەیخون هەلیان کوتایە سەر « سەعدی » بەلام « سەعدی » و یارانی بەکارەساتێکی زۆر سەختو خراپ رزگاربوون و ... تورکە غوزەکان هەرێمەکەیان تالان کرد ـ کە ئەووسپاکەی لە جەولی خویدا لە دژی « سیروان » ەوە هێنابوویان . هەروا ئەم تورکە غوزانە (دەسکەرە) و « باجسرە » و « هارونیە » و « قەصر سابوور » یان هەموو تالان کرد . « سەعدی » لە تاوان بەرەو « دیالی » « بەعقوبە » هەلات ، ئینجا رووی کردە حیللەو پەنای بردە بەر (ئەبو الئەغەر دەبیسی کوڕی میزیەد ) وەلەوێ نیشتەجێبوو . پاش ئەمە « ئیبراهیم یەننال » دژی سیروان » ی داگیر کردو گەڕایەوە بەرەو « حەلەوان » لەوێ دوو کوڕەکەی موهەلهەل (بەدر ـ مالك) ی لەگەڵ خۆی هەلگرتو خەلاتی کردن و پیاوەتی لەگەڵ نواندن[72] .

هەرلەم سالە دابوو کە فەرمانڕەوای » قەلای سەر ماج کە لە کوڕانی بەدری کوڕی حەسەنوەیهی بو ـ مرد . بەلام کێ بوو ؟ ناوی نەزانراوە : ئەوەی راستی بێ مێژوو نووسان تەنیا ناوی « هیلال » ـ یاهەلیل ـ یان بردووە بەلام دەبێ ئەم مردووە کە بەدەستی ئال بویە » لە ناو چووەوە، هەر « بەدر کوری طاهیری کوری هیلال کوری بەدری دووەم » بوبێ کە لە 438 کو . دا فەرمانڕەوا گرتە دەستو بەم جۆرە لە 439 دا کوژرا جا بەمردنی ئەو تۆماری دەسەلاتی بنەماڵەی « حەسەنوەیهی » لە « دینەوەر ـ کرماشان ـ حەلەوان » و جێیانیتری پێچرایەوەو دوایی هات . گەرچی بە پێی سەرچاوەییکی بێ بەلگە « بەرسق » ناوی کوڕی بەدری سێیەم لە « ئەلیشتەر ـ نەهاوەند ـ هەمەدان » دا خۆیو نەتەوەی تاماوە یە فەرمانڕەوابوون و[73] پاش لە ناو چوونی « بەدر » « ئیبراهیم یەننال » ی سەلجوقی دژی « سەرماج » و هەرێمەکانی تریشی داگیر کردو زاواکەی خۆیی ناردە « شارەزور » وەك لە پێشا ووترا .

بەلام پاش ئەوە « ئەحمەد کوری طاهیر » ـ کە زاواو وەزیری یەننالبوو ـ هەلی کوتایە سەر « قەلای تیرانشاە » و گەمارۆیدا ، بەلام هیچی بۆ نەکراو بەدەستی خالی گەڕایەوە ، ئینجا « موهەلهەل » نامەیێکی نووسی بۆ خەلقی « شارەزورو » داوای لێکردن دژی غوزەکان ڕاپەڕن تا بەسپاوە خۆی ئەگاتە فریایان .

مرۆڤی کورد ڕاپەڕینو گەلێکیان لە تورکە غوزەکان کوشت . بەلام « ئەحمەد طاهیر » جارێکیتری شالاوی کردە سەر « شارەزور » و کاولی کرد . وەلی ئەو تورکە غوزانە کە « مەندەلی » یان داگیر کردبوو هەلیان کوتابووە سەر « بەرازەرو » (بەلەدروز) هەر کە لە روباری « سەلیل » نزیك بوونەوە « ئەبو دەلەف قاسم کوڕی محەمەدی جاوانی » بەرانگاریان بوو سەرکوتی کردنو ، غوزەکان پشتیان هەلکردو

هـەلاتن‌و ، چـەنـد یـەکێکی‌تـریـان کـە رویـان کـردبـووە شارەکەی[74]« عەلی کوری قاسمی کورد » و لەو ناوە خەریکی تالان‌و راوو رووت بوون « عەلی » لێیان راپەری‌و لە دەربەندێکا گەمارۆی دان‌و زۆری لێ کوشتن‌و ، هەموو تالان‌و گرانبارەکانی لێیان وەرگرتەوەو راوی نان[75] .

ساڵی 440 کو . « ئەحمەد کوری طاهیر » کـە ساڵی بـو « قەلای تیرانشاه » ی گەماروٚدا بوو بوٚی داگیر نەدەکرا ، بەو هوٚیەوە کە لە هەرێمەکەدا درم‌و طاعون فەتارەتی بەسپاکەی ئەکرد ، نامەی نووسی بوٚ « ئیبراهیم یەننال » و داوای یارمەتی لێکرد . ئیبراهیم فەرمانی‌دا بـەوەی رەو بکات‌و هـەرێمەکـە بەجێ‌بهێلێ .

« ئـەحمەد طاهـیر » زوٚر بەگـورجی ئـەو هـەرێمـەی بـەجێ‌هێشت‌و روی‌کردە مـایدەشت‌و « مـوهـەلهـەل » یش بەپەلەیەکێ لە کورەکانی خوٚیی نارد بوٚ ئەوەی دەس بەسەر شارەزوردا بگری‌و داگیری بکات . هەرکە ئەوان شارەزوریان داگیر کردەوە ، تورکە غوزەکان » ی ناو « قەلای سیـروان » یش تـرسیان لێنیشت لەم کـاتەدا سپـایێ لەبەغـداوە بەرەو « حـەلەوان » هـات‌و دژو قـەلاکـەی گـەمـارودا ، بـەلام سەرنەکـەوت تەنهـا دێهاتـەکانی دەورو بـەریان تـالان‌کردو « موهەلهەل » بەمال‌و خێزانەوە روی‌کردە بـەغداو لە تـرسی غوزەکان لە « باب المراتیب » ی شاری بەغـدا نیشتەجێ‌ی کردن ، ئینجا خوٚی گەرایەوە بوٚ ناو هێزەکـەی ـ کە شـەش فەرسەنـگ دوور لە بەغـداوە لەشکر بـەزیان کـردبوو لەوێ نیشتەجێ‌بو[76] .

هەر لەم سەردەمەدا « سەعـدی کوری ئـەبوالشـەوك عەییاری » کـە پەنـای بردبـووە لای « میزیـەدی » یەکـانی « حیلله » لەگەل ئیبراهیم یەننال » دا ئاشتەوەبوو گەرایـەوە « دەسکەرە » و دەورو بەری « بەعقوبا » یشی داگیرکرد[77]

ساڵی 442 کوٚ « ئەبو ماجید موهەلهەلی عەییاری » چووە لای طوغرول بەگی سەلجوقی » .

طوغـرول بەگ میـریێتی‌یـەکـەی بـەرەسمی نـاسی کـە بریتی‌بوو لەم هەرێمانە : (سیروان ـ دەقـوقا ـ شـارەزور ـ صامغان ) و هەر لەبەر دڵی ئەو « سورخاب کوری محـەمەد کوری عەییاری » برایشی ئـازاد کردو نـاردیەوە سـەر قەلای ماهەکی‌و[78] هەریمی « راوەندین »[79] یشی‌دا بە سەعدی کوری ئەبوالشەوك[80] .

ساڵی 444 کو « سەعدی کوری ئەبوالشەوك » چووە لای طوغرول‌بەگ » و سپاییکی خستە ژێر فەرمانی‌و بەرەو عیراق رەوانەی کرد ، سەعدی لەسەرەتادا لە « مایدەشت » لەشکر بەزی کردو خیوەت‌و خەرگـای هەلدا ، بـاشان رووی کـردە هـەرێمەکـانی ژێر دەستی « ئـەبو دەولەتی جـاوانی » واتـا هەرێمی دیالە ـ کوت « ئەبو دەلەف » سەری خوٚی زرگارکردو « سەعدی » تا « نەعمانیە » ی داگرکردو سپاکەی هەموو ئەو ناوانایان تالان کـردو لەوێوە بـایدایـەوە بەرەو بـەندەنیجـین (مەندەلی) لەوێ کوٚمەلێ لە کوێخایان‌و سەرەك خێـلانی کورد سکالایان لە ستەمکاری « موهەلهەلی مامی » کرد ، سەعدی بریاری‌دا تەمێ‌ی بکات‌و سەر ئەنجام خوٚی‌و مالیکی کوری بە دیل گرت‌و هەرمال‌و سامانێکی خەلکیان زەوت‌و تالان کردبوو هەمووی لێ وەرگرتنەوەو دایەوە بە خاوەنەکـانیان ، کـە ئەم هەواڵە گەیشتە بەغدا » « مەلیك رەحیم ئال بـویە » ئـاخرین پادشای بوەیهی (ئال بویە) بریاری‌دا کە روبکاتە (حەلەوان) و لەگەل سەعدی‌دا بجەنگێ‌و هێزێکی لە رادە بەدەری لەگـەل خوٚی هەلگرت‌و کەوتە رێ ، بەلام لەشەرا شکاو بەرووزەردی گەرایەوە[81] .

ساڵی 445 کو . « بەدر کوری ئەبو الماجید موهەلهـەل » پەنای بردە لای « سولطان طوغـرولی سەلجـوقی » و داوای لێکرد نامەیێ بنوسی : بوٚ « سەعدی کە ئاموزای بەدربو ـ کە موهەلهـەلی باوکی‌و مـالیکی برای بـەرەلا بکات ، سـولطان طوغرول کورە بـارمتەکـەی « سەعـدی » ی لەگەل پیـاوانی تایبەتی خوٚی بوٚ « سەعدی » نـاردەوە ، داواشی لێ کرد کـە موهەلهەل‌و مالیك بەربدات .... بەلام « سـەعدی » گـوێ‌ی نەدایە فەرمانەکەی « طوغرول بەگو » لەشکری کێشایە سەر « حەلەوان » بەنیازی داگیرکردنی ، بەلام کە لە ئامانجەکەیا سەر نەکەوت ئنجا لە نێوانی « روشن قوباد »[82] و « بەردان » دا کەوتە تالان‌و بروٚ . نامەیێکی مل کەچی‌و فەرمانبەرایەتی یانەی‌بوو « مەلیك رەحیم ئال بـویە » نـووسی ... « طوغرول بـەگ » کە ئـەم هەواڵەی بیست زوٚر تـوورەبوو ، سپـایێکی بەهێزی بەفەرمـاندەیی « ئیبـراهیم ئیسحـاق » و « سـەخت کـەمان » نـارد بوٚ پشتیـوانی « بەدر کـوری موهـەلهـەل » و دەستووری دایێ کە « سەعدی » سـەرکوت بکـات ، هەردو

هێزی « بەدر » و سەعدی » دایان بەیەکا ، سەعدی شکستی خواردو پای کرد بە پشتاو هەلاتو تورکە غوزەکان گەڕانەوە بەرەو « حەلەوان » ئنجا « بەدر » بەهێزێکەوە روی کردە شارەزور و « سەعدی » چو لە دژی روشن قوبادا خۆی قایمکرد[83] .

ساڵی 446 کو . مانگی شەوال « ئیبراهیم کوری ئیسحاق بە هێزێکی تورکی غوزەوە لەسەر فەرمانی (طوغرول بەگ) لەحەلەوانەوە روی کردە « دەسکەرە » خەڵقی شار سەریان دا نەهێناو ملیان کەچ نەکردو کەوتنە بەرانگاری ، بەڵام هێزی « غوز » شارەکەیان گەمارودا و خەلقەکەیان بەتەنگ هێنا ، مرۆڤی شارەکە لەشەڕ ماندوبوون و شارەکەیان بەجێ هێشت و غوزەکان چونە ناو شارەکەوە تالانیان کرد ، ئنجا رویان کردە « رۆشن قوباد » کە سەعدی بە خۆی و هێزەکەی و بنەو بارگەو گەنجینەوە سامانی‌یەوە لەوێ و ، لەبەردان بو سەعدی خۆی بۆ شەڕ ئامادە کردو دەرگای قەلاکانی داخست و قاییمی کرد[84] هەر لەم ساڵەدا بوو کە « طوغرول‌بەگ » کەوتە ئارەزووی چوونە حەج و داگیر کردنی میصرو شام و دەرهێنانی ئەم ولاتانە لە ژێر دەستی « موستەنصیری عەلەوی » خەلیفەی فاطمی و ، لەسەر کورسی خەلافەت لادانی .... جا دەستووری دایە سەردارانی « دینەوەر » و « حەلەوان » و شارەکانی سەرەری کە ئازوقەو خواردەمەنی و کاو جۆ بۆ سپاکەی چارەواکان ئامادەبکەن[85] .

ساڵی 455 کووا دیارە ئاخرین رۆژانی دەسەلاتی بنەماڵەی عەییاری‌بوو ، کەپاش رووخانی بنەماڵەی «حەسەنەوەیهی» لەحەلەوان و دەوروبەریدا جلەوی فەرمانرەواییان گرتبووە دەست و لەم‌سەردەمە بەدواوە هەریەکە لەسەرداران لە یەکێ لەقەلاکانی زێردە ستیانا ئەژیان .. چۆن ساڵی 487کو . کە بەرکیارق کوری مەلەکشای سەلجوقی» لە ترسی «تەکش»ی مامەی هەلاتبوو پەنای بردبووە بەر «سورخابی کوری‌بەدر» کەئەو حەلە هەریمی «حەلەوان» یان بەدەستەوە نەمابوو ، بەلکو هەریەکە لەئەمیران لەبە شێکی بچووکی وولاتە پان و پۆرەکەی خۆیان ئەژیان ئەوەتا ئیبن الئەثیرئەلێ :

ساڵی 492 « سورخابی کوری بەدر خێوی دژی کەنگەوەربو[86] . « ساڵی 494 کۆ . کورانی مەلەکشا سەلجوقی (محەمەدو بەرکیارق) لەسەر کورسی پادشایی و تاج و تەخت بوو بە هەرایان و ، « بەرکیارق » بەسەر « محەمەد » ی برایا زال بوو « محەمەد » لە ترسان هەلات بۆ « خۆراسان » و خۆی دایە پەنای « سەنجەر » ی برایان کە فەرمانرەوای ئەوێ‌بوو . هەر دو ریك کەوتن و سوێن خواربوون و بریاریان دا شالاو بکەنە (رەی) کە پایتەختی « بەرکیارق » بوو ، هەرکە « بەرکیارق » بەم هەوالەی زانی نامەی نووسی بۆ سەردارانی هەرێمەکانی ژێر دەستی کە ئامادەبن ـ تەنانەت نووسی بۆ « ئەیاز » ی زڕ کوری میر ئاخورەکەی مەلەکشای باوکی کە فەرمانرەوای هەمەدان‌بوو ـ خۆیشی روی کردە « هەمەدان » بەلام لەرێ بیستی کە « ئەیاز » یش لەگەڵ سولطان محەمەد » ی برایا هاو سوێنە لەبەر ئەوە لە « هەمەدان » لای نەداو بەپەلە خۆی گەیاندە « حەلەوان » و لەوێ مایەوە .. لەم هەلەدا « ئەیازو میرانی‌تری هەرێمەکە چوونەوە لای وە (17) ذی القعیدەی هەمان ساڵ « ئەلموستەظهیری بیللاەی خەلیفەی عەبباسی چوو بەپیری‌یەوەو ناز ناوی سلطانی پێ‌رەوادی‌و دەستووری بەخوێندنەوەی ناوی لە ووتاری هەینی (خوطبەی جومعە)[87] دا .. بەلام زۆری نەبرد کە « سولطان محەمەد » هەمەدانی داگیرکردو « لەگەڵ « سەنجەر » ی برایا بە سپاوە رویان کردە بەغدا » لە شاری « حەلەوان دا فەرمانرەوا ـ ئەو حەلە ـ « ئیلغازیی کوری ئەرتەق » بوو لەفەرماندەیانی سپای « بەرکیارق » بوو ـ بەلام خۆی خستە باوەشی ئەمان و هەموویان دەستەجەم رویان کردە بەغدا « خەلیفەی عەبباسی ئەلموستەظهیر بیللاە » ئەمجارە (بەرکیارق) ی بەرەللا کردو « سولطان محەمەدی » بە پادشای راستەقینە ناسی‌و دەستووری‌دا ناوی ئەم لە ووتاری هەینی‌دا لەگەڵ ناوی خەلیفە خوێندرایەوە[88] .

ساڵی 497 « بەرکیارق » و « محەمەد » پاش شەڕ گەلێکی زۆر سەخت ئاشتەوە بوون و « ئیلغازی کوری ئەرتەق » کە لە بەغدا جێگری « سولطان محەمەد » بوو خۆی بە پەیرەوی « سولطان بەرکیارق » دایە قەلەم ، لەم کاتەدا « صەدەقە کوری ئەبوالفەوارس مەنصور کوری سەیف الدەولە حوسەین میزیەدی ئەسەدی » نامەیێکی پڕ لە هەڕەشەو گورەشەی بۆ خەلیفەی عەبباسی نووسی ئەمەی تیابوو : « لەمەو بەر ، هەرکات « ئیلغازی » سەرپێچی بکردایە لەفەرمانبەری ئێوە تۆ منت تاوانبار ئەکرد ، ئیستە کە

ئەیەوێ سەر لەفەرمانی « سولطان محەمەد » بپێچی ناچارم هەڵبکوتمە سەر بەغداو ئەو لە بەغدا دەربکەم ، پاش ئەم هەرەشەیە بەهێزەوە هاتە ناو بەغداوەو لەوێوە ڕوی کردە ناو لەشکر ، کەی خۆی ، کە لە خۆرئاوای « بەغدادا لەشکر بەزی کردبو . جا « ئیلغازی » بـەغدای بـەجێهێشتو ڕوی کردە « بەعقوبە » و لەوێوە نامەیێکی پڕ لە پۆزشی بۆ « صەدەقە » نووسیو بەم جۆرە نیازی خۆی ڕوون کردەوەکە : مل کـەچ کردنم بۆ بـەرکیارق پـاش ئاشت بـوونەوەی هـەردو برابـوو بڕیاریش وابوو کە هەم « بەغدا » و هەم « حەلەوان » لە ژێر فەرمانم دابێ ، بەم جۆرە بوو کە بەرامبەر « بەرکیارق » مل کەچ بووم »[89] .

ساڵی 500 کۆ . « ئەبوالفەوارس سورخاب کوڕی بـەدر کـوڕی مـوهـەلهـەل عـەییـاری » کـۆچی دوایی کـردو ئەبوالمەنصور » ی برای بۆ بـەجێنشینی . ئەم بنـەماڵەیـە صـەتوسی سـاڵی ڕەبـەق فـەرمـانـڕەوای « حـەلەوان » و « کرماشان » و خۆرئاوای ئێران بوون[90] .

ساڵی 512 کۆ « ئاق سەنقـەری بەرسقی » ڕوی کـردە بەغدا بـۆ بارەگـای « سولطان محـەمەد کـوڕی مەلەکشـای سەلجوقی » بـەڵام بەرلەوەی ئـەو بگاتـە بەغـدا « سولطان محەمەد » مردبوو . جا « موجاهید الدین بیهروز » ڕێی نەدا ئینجـا « ئاق سـەنقەر » ڕووی کـردە بـارەگـای « سـولطان مەحموود » لە هەمەدان هەرکە گەیشتە « حەلەوان « فەرمانی « سولطانی محمود » ی پێ گەیی : کە « موجاهید الدین » لە کار دەرکراوە ئەو لەجێی بۆتە فەرمانڕەوای بەغدا .

خەلیفەکانی عەبباسی کە لە بـەغدابـوون لە صەدەی سێیەم بەدواوە گەرچی ناویان هەبـوو ، دەسەڵاتیـان نەبـوو بـازیچەی دەستی ئـالبویـەو سەلجـوقی بوون تـا دەورانی « موستەرشید بیلاە » ئەم گۆڕێکی سەندو سەری بەرزکردەوە وەکو ئەبینین :

ساڵی 529 کۆ : سولطان طوغرول بەگی سەلجوقی » مردو خەلیفەی عەبباسی « ئەلموستەرشید بیللاە بڕیاریدا « سولطان مەسعودی سەلجوقی » لە سولطانی لابداتو نـاوی ئەوی لە خوطبەی هەینی (خوطبەی جومعـە) لاداو ڕۆژی هەینی ی 20 ڕەجـەبی هەمـان ساڵ بـەسپاوە لە بـەغداوە بـەڕێ کەوتو پێشـەنگی لەشکرەکـەی لەپێشەوە نـارد بۆ حـەلەوان » ئەم پێشەنگانە دەورو بەریان تالان کرد[91] . ساڵی 543 کۆ : هەندێ لە سەردارانی تورکی سەلجوقی لە « سولطان مەسعود » یاخی بوونو لێی جیابوونەوەو رویـان کردە عیـراق ، کە گـەیشتنە « حەلەوان » خەڵکی بەغدا کـەوتنە تـرسو لەرزەوەو ئاژاوە دەستی پێکردو گرانیو گران فرۆشی خەلقی شاری نارەحەت کـرد لەبەر ئـەوە « ئەلـموقتەفی بیـلای خەلیفـەی عـەبباسی دەستـووریدا بەسـازکردنـەوەو تازە کـردنەوەی شـوورەی بەغدا[92]

ساڵی 544 کـو . لە هـەرێـمـی « حـەلەوان » دا بوومەلەرزەیەکی زۆر توندو سەخت ڕوویدا ، وەك ووتـراوە یەکێك لە چیاکان خزاو لەگەل زەوییا یەکسان بوو[93]

سـاڵی 550 کو : « سـولطان محەمـەد کوڕی سـولطان مەحموود کوڕی مەلەکشای سەلجوقی » داوای لە « ئەلموقتەفی بیللای خەلیفەی عـەبباسی کـرد کە نـاوی لە ووتاری هـەینی « خوطبەی جمعە » دا بخویندرێتەوە خـەلیفە ڕێی نـەدا ، « سولطان محەمـەد ڕقی هەستـاو بەلەشکـرەوە رووی کردە بەغداو گەمارۆیدا ، بەلام « مەلەکشای برای لێی ڕاپەڕیو « هـەمەدانی » ی لێ داگیر کرد ، « سـولطان محـەمـەد » گـەمارۆی بـەغدای واز لێهێنـا بـەپـەلە گـەڕایـەوە بـەرەو « هەمەدان » و تاگەیشتە « حەلەوان » هـەواڵی بۆ هـات کە «ئینانج » ی جێنشینی « هـەمەدان » « هـەمەدان » ی لە « مەلەکشا » وەرگرتوەتەوە[94] .

ساڵی 565 کو . « عەبدولـەلیك کـوری محەمـەد کوری محەمەد کوری عەطاء » کە لە هەریمی « حەلەوان »دا خێوی دژو قـەلای زۆربـوو ، لە دەسـەلاتی دەولەت یـاخی بـوو هەریمەکـەی خستە ژێـر ڕکێفی خۆیو کـەوتە تـالانو بڕۆی کاروان ، وەرێگەی هاتو چۆی « حەجاج » ی بەربەست کرد بەلام لە بەغداوە هێزێکی زۆر بۆ سەر کـوت کردنی نیـردراو گەمارۆدرا ، کە هینایانە تەنگ سەری داهیناو مـل کەچ بـوو سوێندی فەرمانبەرایەتی خوارد[95] .

ساڵی 614 کو . « خوارەزم شاە » کە ناوی « عەلائەدین محـەمەد » و « تـەکش » بوو لە خـۆراسانـەوە رووی کردە هەرێمی چیا[96] بەو نیازەی کە خەلیفەی عەبباس ئەبوالعەبباسی الناصرالدین اللاە » لەسەر کورسی خەلافەت لابداتو « سەید عەلائەدینی تـورموزی » لەجێی دابنێو لەبـەرایبدا یـەکێ

لەفەرماندە مەزنەکانی خۆیی بە 15 هەزار سوارەوە خستەڕێو فەرمانڕەوایی « حەلەوان » یشی دایێ ، ئینجا خۆیشی کەوتە ڕێ پاش ئەوەی لە « هەمەدان » تێپەڕی بەسێ قۆناخ بەفر دایگرت ، بەلام چ بەفرێك !! بەشێکی زۆری سپاییکانو چارەواکانی کوشتو ئەو دووای لەشکرە تورکەکە کەوتە بەر ڕەتی تورکمانەکانی بەنو تەرجوم (بەنی پەرچەم) و کوردانی (هەکاری) ئەمان هەموویان ڕووت کردنەوەو تالانیان کردن .

« خوارەزم شاە » ئەم شالاوەی بەشوم هاتە بەرچاوو لە سەفەرەکەی بەدبین بوو بەرەو خوراسان گەرایەوە [97] خەلقی سادەو لەهۆش دوور ئەمەیان بەهیمەتو کەرامەتی خەلیفەی ئیسلام دایە قەلەم هەروەك دەروێشو صوفی یەکان جار جارە شتی وەها دەربارەی شێخەکانیان ئەگێڕنەوەو لایان وایە کە گەردشی گەردون بەدەست ئەوانەو ئەم سوروشتو کردگارە بازیچەیە !؟ ئەی هۆ ...

دانەری « روضة الصفا » باشتر باسەکەی ڕوون کردۆتەوەو نووسیویە « کەسولطان گەیشتە دەرتەنگی حەلەوان (کەعەرەب ناویان ناوە عەقەبەت حەلەوان) سەردەمی پاومانی پاییزو سەرەتای زستان بوو سولطانو سوپاکەی کەوتنە داوی شەڕی بەفرو باران ، ئەوەندە بەفر باری کە خیوەتەکانیان لە بەفردا نقوم بوو .

وادیارە « کەمال ئیسماعیلی » ی شاعیرو هەستیاری مەزن لەم سەردەمەدا ئەم فەردەی ووتووە :

مانند پنبه دانه که در پنبه تعبیه است

احرام کوهها است نهان درمیان برف[98]

[ واتا هەر بەو جۆرەی قوزاغەی پەمۆ بەپەمۆدا ئەپۆشرێ بەرزەهاری کێوەکان پەنهان بوون لەنێو بەفرا ] ـ ئەمە ئەگەر ووشە فارسییە (ئیحرام ، بێ و دووریش نییە ئەجرام بێ ـ واتا قەبارەی کێوە ] .

سالی 655 کۆ . مانگی شەوال « هۆلاکو » لەسنووری هەمەدانەوە کەوتەڕێ بەلای ڕاستا « سوغانجق نوین » وە « بایجونوین » ی بە پێشەنگی بەلای ڕاستا بەرەو « هەولێر » بەلای ڕاستی چیاکانی « شارەزوور » و « داقووق » دا خستبووە ڕێو « کیت بوقا نوین » و « ئەلکیانوین » یشی بەلای چەپا بەرەو لای « کریتو بەیات »[99] ناردو پادشاە (هۆلاکو) خۆیشی بەناو جەرگەی لەشکرەکەوە بە « شارێی » کرماشان

« حەلەوان » دا بەرەو خوار کەوتە ڕێ ، لەبەغداشەوە بۆ بەرانگاری ئەم لەشکرە زۆرە دوانداری بچوك هاتبووە کناری سیروان (دیالی) و لە نێوان (بەعقوبە) و (باجسرە) دا لەشکر بەزێکردبوو .. پادشاە دەستووری دابوو بە « بایجو » کە لە « دەجلە » بپەڕێتەوەو لای خۆرئاوای بەغداد بگرێ ... پادشاە خۆی هەرکە گەیشتە « حەلەوان » لەوێ بارو بنەی بەجێهێشتو لەگەل سپادا سەلتە سوارە کەوتە ڕێ .. تاد[100]

لە « دائرة المعارف ئیسلامی » دا نووسراوە : « کە لە سەدەی حەوتەما شاری « حەلەوان » وێرانەبوو[101] .

دەبێ لە سەدەی حەوتەما دیسان بوومەلەرزەی تیا ڕوودابی وەگەر نە ئەوەندە وێرانە نەبووە کە خەلقی تیانەبێ ، چۆن لە صەدەی هەشتەما هێشتا باسی مێژوویی « حەلەوان » هەر بەرچاو ئەکەوێ .

**سالی 703 کو . « سولطان محەمەد خودا بەندە » ، کە لە سەر تەختی پادشایی دانیشت نیازی وەهابوو کە سپا بەرەو میصرو شام بخاتەڕێ . بەلام کە بیری کردەوە هێشتا هەرێمی « مازەندەرانوگیلان » سەریان دانە نەواندووە ، ئیتر نابێ بچێ تائەوێ سەر شۆڕنەکاتو بەرهۆیەوە گەنجینەی وولات پڕنەکات .**

جا دەستووریدا کە « ئەمیر چوبان » لە ڕێی « ئەردەبیلە » وە بڕوات بۆ « گیلان » و داگیری بکات وە « ئەمیرقتلق شاە » یش لە ڕێی « حەلەوان » ڕوبکاتە (فومن) و « رەشت » ، و تەولەم »[102] من لام وایە خاوەنی « روضە الصفاء » ناوی « حەلەوان » ی بەهەلە نووسیوەو مەبەستی «خەلخال » ە وە « ئەمیرقتلق » لەوێوە چووە بەرەو هەرێمی « گیلان » هەروەك « حافظ ئەبرو »[103] نووسیویە سالی 789 کو . لەسەردەمی پادشای سولطان « ئوەیسی جەلائیری » دا کابرایێ کە ناوی « عبد الملك تەمغاچی » بوو وەیەکێك لە فەرماندەکانی « جەلائیری » بوو دەستی بەسەر « بەغدا » داگرتو داگیری کرد یەکێکیتریش لە فەرماندەکانی کە ناوی « ئەمیر عادل » بوو ئەویش هەر مرخی لە بەغداو هەموو عیراقی عەرەب خۆش کردبوو بۆ گەیشتنێ بەمراز « تورسن » ی کوڕی خالی خۆی بەرەو بەغدا خستبووە ڕێ « عبدالملیك » ویستی بەبەرتیل « سولطان ئوەیس » ڕازی بکات کە واز لە بەغدا بهێنێو بەلەرشکرییەوە ڕووی تێ نەکات . هەر لەبەر

ئەوە بڕیاریدا خواجە حەمید بنێرێ بەرەو لای « سولطان » بەدیاریو دەهەنەو چەند تۆمان (10000) زێڕی سووری زیوی سپیو چەكو كالاوە ... بەلاّم هەر ئەو شەوەی كە بڕیاربوو كە « خواجەحەمید » بكەوێتە ڕێ لە « حەلەوان » ەوە هەواڵ هات كە « تورسن » كە بەرەو بەغدا جماوە بەسپاوە » « عەبدالمەلیك لەم هەواڵە زۆر دلگیربوو گەنجینەكەی ڕاگرتو نەینارد[104] .

ساڵی 795 كو . پاش ئەوەی « ئەمیر تیمور گورگانی صاحب قران » « تەیموورلەنك » « سولطانیە » ی[105] داگیركرد ڕووی كردە بەغدا هەر كە گەیشتە هەرێمی كوردستان « هەرێمی « ئەردەلان » ئەسپردەی گەییشتو هەواڵی گەیاند كە دەبێ میرزادەكانو فەرماندەیان هەموو پێكەوە بەرێی « چەمچەماڵ »[106] دا بچمێن جا ئەوان لە سەر فەرمودەكەی « صاحب قران » لەوێوە گەڕانەوەو گەیشتنە شوورەو دەورو بەری « سونغور » و ئەو ناوەیان هەموو ڕامـاڵی دەغڵو دانو خەڵەو كشتی ئەو ناوەیان تالاّن كردو دایانە چارەواكانی سپاكەیان .. سەر لەبەیان كاتی كوچو ڕەو بوو پەیكێكی تر لەلایەن « صاحبقران » ەوە گەیشتو هەواڵی هێنا كە پێویستە لە پێشا كوردەكانی ئەو ناوە مل كەچ و فەرمانبەر بكەن وەهەر كەسی سەری هەڵبڕیو یاخیبوو وولاتەكەی تالاّن بكەن وسەر زەوی ئەو ناوە بەچیاو دەشتو دەرو شیوو دۆڵو دێهاتو شارەوە ، لەسەر كێشو یاخی پاك بكەنەوە .

میرانو فەرماندەیان كە گەییشتنە چەمچەماڵو چیایی بەغستون (بیستون) لە هەمان كاتا «سونجك بەهادر»و «تەیمور خواجە ئاقبوغا»و «نوبەشیر بەهادر»یش بە سپاییكی ترەوە بەغار بۆ لایێكی تری كوردستان ڕەوانە كرابوون . شازادەكان ڕویان كردە دەربەندی (تاشی خاتون)[107] هەر كە گەیشتنە ئەوێ یەكێ لە سەردارانو سەرۆكانی ئەوناوە بە تەمای پایەی «میرایەتی»ی هەرێمەكە هاتەپێریانەوەو پێی ووتن : «من لە هەموكەسی پتر شارەزای ئەم ناوەم ، ئەگەر دەستووربدەن ئەبم بەڕێ نوماتان» .

«ئەمیرزادە موحەمەد سولطان» لاواندییەوەو خەلاّتی كرو كەمەربەندو شمشێرێكی كالاّن زێڕی دایێ ، فەرمانیدایە «شیخ عەلی بەهادر» كە بە هێزێكی پێشەنگەوە لە گەڵێ بڕوات . لەم كاتەدا «ئیبراهیم شاە»[108] كە یەكێ بوو لە میرە مەزنو فەرمانڕەواكانی ئەو هەرێمە سەری فەرمانبەری دانەواندو خۆی بەمل كەچو پەیرەو دایە قەڵەمو «سولطان شاە»ی كوڕیشی بەرەوەیێ ئەسپو ئیسترو دیاریو دەهەنەی شایەستەوە بۆ شاهزادەكان نارد پاشان خویشی گەییە بارەگای ئەمیر . ئنجا «ئەمیر زادە محەمەد سلطان» ناردی بەدوای «شیخ عەلی بەهادر»دا كە بگەڕێتەوە ، ئەم پاڵەوانە جیهانییە كە گەڕایەوەو لە ناوەندی ڕێدا دابەزیبوون بۆ نیوەڕۆژە ، لە ناكاو كابرای ڕانوما كە لە هیواكەی نائومیدبوبو ـ هەڵی كوتا سەری (ئەم شیخ عەلی بەهادرە)و دایە بەر خەنجەرو كوشتی یاوەرانی «شیخ عەلی بەهادر» دەست بەجێ كابرایات گرت وەكوشتیانو لاشەكەیان سووتاند[109] .

ساڵی 795 كو . لە 20 رەبیع الئەول‌دا كە ئەمیر تەیمورلەنگ شوشتەری داگیر كردبوو دیسانەوە «ئەمیر زادە پیر محەمەد سلطان»و «ئەمیر زادە محەمەد» بەرێی ئەم دەربەندی «تاشی خاتوون»ەدا چون بۆ خزمەتی صاحیبقرانو شارو دەشتو دیهاتو دۆڵەكان كوردستانو لورستانیان سەربێ ـ شۆر كردو یاخییەكانیان قەلاّچو كرد .[110]

لە 13 شەوالی هەمان ساڵا دیسانەوە «ئەمیرزادە محەمەد سلطان» بەر لەوەی ڕوبكاتە بەغدا كەوتە ئەندیشەی سەر كوت كردنی كوردە یاخیو ڕێگرەكانو هەڵی كوتایە سەر هەرێمە چیاییەكان گەلێكیان نابود كردو هەندیكیشی سەر شۆڕو مل كەچ كرد ... بۆ نموونە 700 كەسی كوردە یاخییەكان لە چیاكانا دەستگیركردو هەموویانی غل كردە خوارەوەو بەم جۆرە هەموی كوشتن ، ئنجا بەرێی «دەربەندی تاشی خاتون»دا ڕووی‌كردە بەغدا بۆ خاكیا ماچكردنی «ئەمیرتەیمور صاحیبقران»[111] .

**حەڵەوان كەی ویرانبو ؟**

لە هەواڵەكانی ڕابوردو بۆمان دەركەوت كە حەڵەوان تاسەدەی هەشتەمی كۆچی هەر ئاوەدانبووەو بەرامبەر بە هەموو زەبرو زەنگی دڕندەیانەو چانەوەرانەی (ئال بویە ـ سەلجوقی ـ خوارەزمی ـ تاتاری ـ مغولی ـ ئێلخانیو هێرشبەرانو شالاوگەران خۆی ڕاگرتووە . بەلاّم لە صەدەی هەشتەما بەتەواوی ویرانو كاول بووە . «مستەوفی قەزوینی» نووسیویە : (ساڵی 745 كو : حەڵەوان كاولبو بوتەنیا ئەوەندەی كێڵگەو داڵیەیێكی (مەزرەعەیی) بە ئاوەدانی مابوو)[112] ئەویش لەشالاّوی «تەیمورلەنگ»دا یەكجاری ویران بوو لەوەدووا تەنیا بە ناوی «دەرتەنگ» ەوە یادی لێ كراوەتەوە .

لە سەدەکانی (9) و (10) کۆچیدا هەرێمی حەلەوان (دەرتەنگ) لەژێر فەرمانی «ئەمیرانی کەلوڕ»و ئەمیرانی «ئەردەلان» دابووە . ماوەیێکیش لە ژێر فەرمانی «ئەبوبەکر ڕۆژبیانی» دابووە کە لە سالانی 960 بەدواوە هەولی ئەوەی داوە نێوانی «سوهراب بەگی ئەردەلان»و «محەمەد پاشای بالتەچی» والی بەغدا ڕێك بخات[113] کە کەمتر ووڵاتەکە وێران بێ‌و ، کەلەکە بەد بەخت نەبێ لەسەردەمی «ئەمیر شەڕەفخانی بتلیسی»دا ـ کە شەرەفنامەی داناوە ـ هەرێمی دەرتەنگ (حەلەوان) لەدەس قوباد بەگی کوڕی عومەر بەگی سوهراب بەگی کە لوڕەوە بووە کە بە پێی فەرمانی «سولطان سولەیمانی قانونی» فەرمانڕەوابووەو هەر لە «دینەوەر»ەوە تا سنووری بەغدای لە ژێردەستا بووەو ئەم دژو قەلایانەی ووڵاتەکەی لەوکاتەدا زۆر بەناوبانگ‌و سەختبوون (پاوە ـ باسکە ـ ئالانی ـ قەلا زنجیر ـ ڕەوانسر ـ دەوان ـ زڕمانیکی)[114] لەمانە تەنیا (زڕمانێکی) شوێنەواری دیارنییە ، ئەو دروویان ئاوەدان‌و ناسراون .

لەم سەردەمەدا سەرپل (سەر پردی) زەهاو جێی حەلەوانی گرتۆتەوە ـ کە کوردەکان پێی ئەڵێن (سەرپێل) «ژاك دومورگان» نووسیویە : «سەر پوڵی زەهاو لە جێی «خەلمان»ی دێرینەدایە ، ئەم جێگەیە لە زۆر کۆنەوە ئاوەدان بووە ، کناری ڕوبارەکە هەندێ تەپۆلکە هەن ، لە کۆنا کۆشك‌و سەرابوون[115] ئەمە وەهاو ئاوی «ئەلوەند» چون لێرەوە دێ هەندێ ناویان ناوە ڕوباری «حەلەوان»

## دێرینەی کۆن لە هەرێمی حەلەواندا :

لە هەرێمی حەلەواندا شوێنەوارو دێرینەی کۆن زۆرە . بەلام با گوێ بدەینە «ژاك دومورگان» کە لەم بارەوە پسپۆرە ، ئەو نووسیویە :

«لە هەرێمی حەلەواندا تەختە بەردێکی هەڵکەندراوم دۆزییەوە کە هی «شاە ئانو بانینی»یەوە ANNOBANINI یەوە یەکێکە لەبەردەنووسە هەرە کۆنەکانی جیهان لە بەشی ئاسیادا (ـ) کە من چاوم پێ‌کەوتبێ ـ ئەم تاتە بەردە سێ مەتر لە بانە بەرزەکەوە بلندە . «شاە ئانو بانینی بەم پەیکەرەدا وەها نیشان دراوە کە پای چەپی خۆی ناوەتە سەر لەشی دیلێکی بێ دەسەلاتاو ، لە خواجە «نینی» (خواژن)یش ڕەدیل وەردەگرێ ، کە یەکێکیان زنجیر خراوەتە کونە لوتی ، لای خواریشەوە شەش کەسی‌تری زیندانی بەدی ئەکرێن لەیەکێکیان پادشایە .

بەردە نووسەکە بەسێ هێلی ئاسۆیی‌و بیست‌و دوو هێلی سێ ستونی (افقی عمودی) بەشکراوە . بۆ بەدبەختی‌ی مێژوو نووسینی بەردە مەڕمەڕەکە بەهۆی بارانەوە (پاشتی‌ترەوە) سڕاوەتەوەو هێلی هەرە دوایی بەتەواوی لووس بووەو ناخوێندرێتەوە ، من بۆ ئەوەی بتوانم بگەمە تاتە بەردە هەڵکەندراوەکە ناچار بووم پەیژەیێکی زۆر درێژ دروست بکەم‌و پیاسەر بکەوم‌و قالبی بەردە نووسەکە بگرم‌و بەهۆی زەرەبینێکی هەم بوو ووردە ووردەکانی بخوێنمەوە .»

«بەردە نووسەکە وەهایە : «ئاننو بانینی پادشاهی دەسەلاتدار شای لوولووبی (ك ـ ئیم) Loulou (k — im) پەیکەرەی خۆیو پەیکەرەی خواجەنی‌نی (خواژم نی‌نی) لە کێوی باتیر (پادیر) BATIR) PADIR ئەوکەسەی کە ئەم بەردەنووسەی هەنکەندووە کە (ئەنوم) (ANOUM) ئانات ANATو ئەنگیت ANKITو بلکیت BELKITو ئەدەد (ADAD)و نی‌نی‌و سین SINو سلماس SAMAS ـو .... نەفرین‌و لەعنەت لەو کەسانە دەکات دەکات ، کە نەعلەت‌و نەفرین لەپۆلەکانی بکەن .»[116]

دیاکونۆف پتر ئەم بەردەنووسەی ڕوون کردۆتەوەو نووسیویە : «لەبەردەنووسە زەقەکەی ئانوو بانینیدا پادشاە بەجلی (ئەکەدی) یەوە نیشان دراوە (کلاوێکی لبادینی بەزەوق‌و داوێنێکی ڕیشەدارو کەمەربەندێکی ووردەکاراندو کەوشێکی صەندەل)[117] دیلەکان تەنیا کلاویان لەسەرە ، لە نۆ پەیکەرەکەی میرەکان هەشتیان کلاوی سۆمەری‌و ئەکەدییان لەسەرەو نۆیەم کە لە ڕیزی هەرە دواییدا لای پێشەوەیە کلاوێ (تاتاجی) یکی لە سەردایە ، کە لە هەزارەی بەر لە زایندا (واتا سێ هەزار ساڵ لەمەوبەر) تایبەتی‌ی مادەکانی خۆرهەلاتی‌بوو پاشان فارسەکان لەوانیان قوزتەوە هەر چۆن‌بێ لە هەرێمێ «حەلەوان»دا شوێنەوارو دێرینەی کۆنی سەردەمی «لولوبی ـ گوتی ـ کاشی ـ ماد ـ هەخامەنشی ـ پارتی (ئەشکانی) و (ساسانی) زۆرە .[118]

ئەمەش لە موجمەل التەواریخ‌و القەصەص‌دا نووسراوە کە نووسینەکەی هی (520) کۆچییە :

یەلاش کوڕی فەیروزی ساسانی)[119] (484 — 488)ز دووشاری

دامەزراندووە . بەکیکیان «بەلاش ئاباد» کەنزیکی «مەدائینی» بوو . دووەم (بەلاش فرای نزیکی) «حەلەوان»ە ئێستە خەرابەن . لەم سەر سنوور دەدا پەیکەرەیی بەسەر بەردێکەوەنەخش کراوە ، کە هەم «پیت»و هەم «نەخش»و نیگارەو نەزانراوە بخوێنریتەوەو بەسەر گردۆلکە بیکەوەیەولەو جۆرە مەرمەرە شینە (کەبەردەسەکەیە) لەو هەریمەوانی‌یە . ئێستە نزیك بەگردولکەکە دیێ‌یێ هەیە بەناوی ئەو پەیکەرەیەوە ناونراوە (رون‌وولاش) ولەو نزیکانە جێ‌ی رادێکیشی هەیە ناوی (وولاش گورد)[illegible])ەو .

شوێنەواری دیواری ڕاوەکەشی لەبەردە بەداوێنی کۆێکی بەرزەوەیە کە ناوی خۆرمەند) ەو هێشتا مەرماو[illegible] .

**زانلو ئەدیبی سەرحەلەوان :**

ئێمە ئەگەرچی ئەتوانین زۆر زۆر لە ئەدیب‌و نووسەرو هەستیارە کوردەکانی پاش هەزارەی کۆچی پالشت بدەینە هەریمی حەلەوان وەك «خانای قوبادی‌و ئەلماس‌خان» تاد .. بەلام چۆن ناوی هەریمەکە گوڕاوە ئێمە تەنیا ناوی ئەوانە ئەبەین کە لە مێژوودا ناویان هاتووە .

1 ـ ئەبوسەهل ئەحمەد کوڕی محەمەد کوڕی عاصمی حەلەوانن : یەکێ بووە لە نزیکانی حوسەین کوڕی عەبداللا ـ کوڕی عەبدالرەحمان کوڕی عەلاء سوککەری‌و ، نووسراوەکانی ئەوی بۆ خەلك ئەووتەوە ، کە لای خۆی خوێندبووی‌و خەط (چیر)یکی زۆر ناشیرینیشی هەبوو ، بەلام لە ڕێزی زانایان ئەدرایە قەلەم کتێبی (ئەلمەجانین النّودەباء هی ئەوە .[illegible]

2 ـ شێخ ئەبو سەعدی کوڕی یەحیا کوڕی عەلی کوڕی حەسەنی حەلوانی :

سالی 450کو . لە دایك‌بووە لای شیخ ئەبو ئیسحاق شیرازی زانستی ئایینی‌و (ئوصول‌و خیلاف) خوێندوە وەهەروا لەلای ئەوو لای ئەبوجەعفەری کوڕی موسلیمە فەرمایشی (حەدیث) خوێندووەو لە شاری بەغدا ماوەیێ «موحتەسیب» (سەرپەرشتی کاروباری ئایینی‌ی شارەوانی) بووە سالی 495 کو «موستەظهیری بیللای خەلیفەی عەبباسی» ئەوی لەگەل سەعادەی کوڕی عەبداللای رومی‌و چەند کەسێکی‌تردا بەئەسپی‌دەبی (وەفد) ناردووە بۆ لای «سولطان محەمەد مەلەکشای سەلجوقی : سالی 520کو . موستەرشیدی بیللای خەلیفەی عەبباسی» ناردوویە بۆ ماوراء النەهر (ئۆزبەکستان) کە خەلاتی خەلیفە بدات بە «خاقان محەمەد کوڕی سلێمان» فەرمانرەوای ئەو ناوەو لەم سالەدا کۆچی دوایی کردووە ئەم پارچە هەلبەستە هی‌ئەوە :

مررت بخباز احاول حاجة مدلا عليه ـ أي ـ بأني عالم فلما رآني قال : اهلاً ومرحباً ظفرت بما تهوى فأين الدراهم ؟

**فقلتُ : معي كسر ونقص وخـاطري يعيش فصـولاً كلهن لوازم**

**فقال : ومن هذي النخائرُ عنده يحاول عندي حاجة ويساوم لعمري : لو بعت الجميع بلقمـة لما كنت ممن في الشـراء يخاصم**

[واتا رابوردم بەلای نانەوایکا بەتەقەلای پێتەویستی[illegible] نازیشم بەسەریا ئەکرد ـکەمن ـزانای دانشمەندم ..کە دیمی ووتی ئەی بەخێر هاتی ! گەیشتی بەمرازەی شەیدابیت ! کوا پارەکان ؟

ووتم : کەمم هەیە ، ناتەواوە ، دلیشم هەزار لوغانە ئەژی‌و هەمووی پێداویستە ...

ووتی : کەسێ ئەمەندە ئازوقەو پاشەکەوتی هەبێ ئایالای من تەقەلای پێتەویست ئەکاو ماملەش ئەکا ... بەگیانی خۆم ئەم شتانەت گەر هەموو بفرۆشێ بەتیکەیێ ، من اەوانە نیم لەسەر کڕینی کێشە بکەم]

3 ـ ئەبوبەکر ئەحمەد کوڕی عەلی کوڕی بەدران کوڕی حەلەوانی بەغدایی زاهید :

کە ناوبانگی (خالۆ) بوو ئەم پیاوە فەرمایشتی پەیغەمبەری (حەدیث) لە زمانی ئەبوطەیبی طەبەری‌یەوە ئەگیڕایەوە .

«کتێبی لە طائیف المەعاریف» یەکێکە لە نووسراوەکانی ئەو . لە نیوەی جومادی الاولی سالی 517 عەمری خوا بەجێ هێنا .

4 ـ ئەبو المەعالی عەبد الرەحمان کوڕی محەمەدی حەلەوانی مەروەزی : یەکێ بووە لە زانایانی سەر بەرچی شافیعی‌و لە فەرمایشتدا (حافظ) بووە .. واتا صەد هەزار حەدیثی

لەبەر بووەر فیقهی ئیسلامی لە شاری نیشاپور، خوێندووەو فەرمایشتی لە (مەرو) گوێ لێبووە ، «ئەبو سەعدی سەمعانی» و زۆری‌تر ، فەقێی ئەو بوون سالی 539 کۆکۆچی دوایی کرد .

5 ـ ئەبو رەجاء حەلەوانی :

فەرمایشتی پەیغەمبەری لە زمانی باوکی خۆیەوە ئەگێرایەوە کە لای مەلاکانی شارەزوور فێربوبو

(ئەمە بوو کەلالەیێکی مێژووی حەلەوان)

## پەراوێزەکان .

(58) ئەلکامیل (9/ 248) .

(59) موجمەل التەواریخ وەالقەصەص (396 — 402) .

(60) ئەلکامیل (261/9)

(61) ئەلکامیل (401/9)

(62) لە پەراوێزەکانی شەرەفنامەدا ئەم ناوە هاتبو ، وازانرا بو کە مەبەست لە «سیروان» قەلای شیروانەیە ، بەلام بەپێی پەراوێزەکانی موجمەل التەواریخ لاپەرە 337 «سیروان» لەجی ماهسەبنرانی کۆنی بناری چیایپشتکو نزیك بە «      » و «مەهدی عەبباسی» لەوێ نێژراوەو ئێستە پێی ئەوترێ حوسەین ئاوا .

(63) ئەلکامیل (403/9)

(64) هەرچەندە جێگەی «تیرانشاە»یە ـ کە هێندێ کردوویانە بە «بیزار شاە» ـ بەڕاستی دیاری نییە ، بەلام دوورنییە لەچیای (قەرەداغ)دا بوبێ لەدەورو بەری دەربەندی خان .

(65) «سندە» خاوەنی نامیلکەی کرمانشاەو نووسەرانی تری وایان داوەتە قەلەم کەمەبەست «سنە»ی ئەمڕۆیە . بەلام دوورە .

(66) صامغان : لەفەرهەنگەکانا ناوی نییە ڕەنگە هەلەبجە یاخورمال بووبێ .

(67) ئەلکامیل (512/9) (68) ئەلکامیل (517/9)

(69) ئەلکامیل (528/9)

(70) ئەلکامیل (532/534)

(71) ئەلکامیل (2536/9)

(72) ئەلکامیل (538/9 — 539)

(73) لورستان (243) لەزمانی (طەبەقاتی سەلاطین ئیسلام)ەوە لاپەرە (124) .

(74) ئەم شارە دەبێ «سومار»ی ئێستە بووبێ . کەدەکەوێتە پشتی چیای مەندەلییەوە .

(75) ئەلکامیل (539/9) (76) ئەلکامیل (540/9)

(77) ئەلکامیل (549/9)

(78) ئەم قەلای «ماهەکین»ە دەبێ ئەوجێیەبێ کەپێی دەوترێ قەلا سپی ، نێوانی «مەندەلی»و عیلامداو یەکێ بووە لەقەلاکانی عێلی «ماهین»ە .

(79) راوەندین : دەبێ ئەو جێگەیەبێ کەپێی ئەوترا «روزانات» «لەنێوانانی» ئەهرەوان ـ خالص)دا .

(80) ئەلکامیل (551/9)

(81) ئەلکامیل (580/9)

(82) روشن قوبادو بەرەدان ، وادیارە دوو جێگەی سەخت بووبن لەچیای حەمریندا دوورنییە لەدەورو بەری مەنصوریەت الجەبەل‌و چیاکەدا بووبن .

(83) ئەلکامیل (594/9)

(84) ئەلکامیل (602/9)

(85) هەمان سەرچاوەو لاپەرە

(86) ئەلکامیل (25/10/ — 174 — 2284)

(87) لەسەردەمی سولطانی ئال بویەو سەلاجیقەدا ، خولەفای عەبباسی هەر ئەم بەهرەیان هەبوو کە ناویان لەخوطبەدا بێ ، ڕێ بدەن ناوی سولطانەکان لەگەل ناویان بێ .

(88) ئەلکامیل (308/10 — 309)

(89) ئەلکامیل (372/10)

(90) ئەلکامیل (438/10)

(91) ئەلکامیل (25/11)

(92) ئەلکامیل (132/11)

(93) ئەلکامیل (146/11)

(94) ئەلکامیل (213/11 — 215)

(95) ئەلکامیل (350/11)

(96) مەبەست لە هەرێمی چیا ئەو سەر زەوییە شاخاویەیە کە عەرەب پێیان ووتووە (الجیبال) ومدەکەوێتە نێوان ئەصفەهان ـ زەنکان بولای سەدەوەو پشتکو ـ زاگروس قەندیل لای خوارەوە .

(97) ئەلکامیل (317/11)و ئەز عەرەبستان تا دەیالمەی عەبباسی پەرویز (563) .

(98) رەوضة الصفاء (400/4)

(99) کریت‌و بەیات دوو شار بوون لەنێوانی (مەندەلی ـ پشتکۆ)دا ، تورکە بەیاتە مەغولیەکانیان تیا بوو «شاهویردەخان»ی میری لوڕی لێیان جاڕس بوو بوو ، دای بەسەریانا قەل فڕی پێ کردن . شا عەبباسی صەفەوی لەو کارە تووڕە بوو لەگەل شاهویردی خان کەوتە شەڕەوە ـ شاهویردی شکستی خواردو خۆی خستە پەنای عیراق ـ بەیاتەکان هەندێکیان خۆیان کەیاندە پەنای (عوثمانی)و

هەندێکیان گەڕانەوە .

(100) زەیل خواجە نەصیری طوسی (283/3 ، 284) تەریخی جیهان گوشاکی جوەینی .

(101) دائیرەت المەعاریفی ئیسلامی (55/8)

(102) رەوضەت الصفاء (440/5)

(103) زەیل جامیع التەواریخ رەشیدی حافظ ئەبرو (70) .

(104) هەمان سەرچاوە (71)

(105) سولطانیە شارێ بوو لەچەمەنی نێوانی زەنگال‌و ئەبهەردا ، کە قەلەمڕەوی میرەکانی سیامەنصور بوغازان خانی مغول دروستی کردبوو زۆر نەمایەوە وێران بوو .

(106) چەمچەمال ناوچەیێکە سەر بە «صەحنە»ی کرماشانە ، لەسەرە ڕیگەی خاکی کرماشان هەمەدانە .

(107) تاشی خاتون (تاجی خاتون) ناوێکە مەغوولەکان‌و تاتارەکان داویانە بە دەرتەنگی حەلەوان .

(108) وا دیارە ئەم ئیبراهیم شاەیە باپیرە گەورەی میرەکانی کەلوڕ بووە کەپاش ئەوە هەرێمەکەیان هەر لەژێر دەستدا بووەو دوای (عەییاری) یەکان پەیدا بوون .

(109) ظەفەر نامەی عەلی یەزدی (230 — 31) چاپی ئوزبەکستانی شوورەوی .

(110) هەمان سەرچاوە (333) .

(111) هەمان سەرچاوە (245 — 246)

(112) نوزهەت القلوب (42 — 91)

(113) موزەکیرات مەمون بەگ لاپەڕە (78)

(114) ئەو جێکەیانە ئەمڕۆ هەموو ماون تەنیا (زڕمانێکی) نەبێ هەلەو ڕاستیی بەرنەکەوت ئەم باسە لە شەرەفنامەی فارسی (411)و عەرەبی‌یەکەی (340)دایە .

(115) جوغرافیای غەربی ئێران (109/2)

(116) جوغرافیای غەربی ئێران ، نووسینی ژاك دومورگان وەرگێرانی دوکتور کاۆم وەدیعی ، فارسی (109/2) .

(117) تەریخ ماد ، نووسینی دیاکۆنوف ، وەرگیرانی کەریم کیشاوەرز بەفارسی (138)

(118) تەئریخ ماد لاپەرە (100) .

(119) ئەوەی ڕاستی بێ «بەلاش کوری فەیروز» نەبوو ، برای فەیروزی کوری یەزدی گوردی دووەم‌و پاش کوژرانی ئەو (484ز) لەجێی ئەو لەسەر تەختی شاهی دانیشت .

(120) ولاشکرد ناوی گردۆلکەیێکە نزیك بە سەر ئاباد .

(121) موجمەل التەواریخ‌و القصەص (72)

(122) فیهرست ئیبنی نەدیم (136) وەرگیراوی فاری رضا تجرد

(123) خەریدة القەصر وەجەریدە العەصر (56/3) لێکۆلینەوەی محەمەد بەهجەت ئەثەری .

سرنج

---

سەرچاوەکان : (من تەنیا (ئەلکامیل)م هەبوو لە کتێبی عەرەبی‌دا وەختی ئەم ووتارەم نووسیبوو هەر لەبەر ئەوەی نووسەرانی پاش ئەو هەموو قسەی ئەویان نوو سیوە ، بەئەو وازم هێنا .

- موعجیم البولدان ـ نووسینی یاقوتی حەمەوی
- ئەلکامیل ـ نووسینی ئیبنی الئەثیر
- مێژووی ماد نووسینی دیاکۆنوف وەرگێرانی کەریمی کیشاوەرز بەفارسی
- ئیران ئەز ئاغاز تائیسلام دیاکۆنوف وەرگێرانی دوکتور محەمەد موعین
- ئەلئەخبار الطیران ئیسلام ئەبو حەنیفەی دینەوەری وەرگێرراوی فارسی صادق
- صورەت الأرض ئیبنی حەوقەل ، وەرگیرراوی فارسی شەعار
- ئەلبولدان ئیبنی فەقیە وەرگیرراوی فارسی دوکتور محەمەد ئایەتی
- فتوح البولدان لاذوری
- روضە الصفا
- دائیرة المەعاریفی بوطروس بوستانی
- ئەز عەرەب تا دەیالم (عەباسی پەرویز)
- ئەلئەغانی ـ ئیصفەهانی
- ئەلتەنبیە وەلئیشحاف «مەسعودی»
- تەریخ طەبەری وەرگیراوی فارسی ئەبو القاسم پایەندی
- میرئات العیبەر
- شەرەفنامە تبلیسی وەرگیرراوی عەرەبی‌ی خۆم .
- موجمەل التەواریخ‌و القصەص (نەناسراو)
- دائیرەت المەعاریفی ئیسلامی
- کرمانشاه
- زەیل جامیع التەواریخ رەشیدی ـ حافظ ئەبرو
- ظەفەرنامە عەلی یەزدی
- نوزهەت القلوب کوئیبنی المستەوفی قەزوینی
- موذەکیرات مەئمون بەك
- جوغرافیای غەرب ئێران ـ ژاك دومورگان
- خەریدەت القەصرو جەریدەت العەصر
- فیهرست ئیبنی نەدیم
- ئەلئەعلام زەرەکلی
- ئەلوالی بیلوە خەیات صەفەوی
- طەبەقات سوبوکی .

(حوسێن ڕەشوانی)

# دوو نامە بە دوو چامە

یەکیان نامەیێکی شێخ عومەری بیارەیە کە نازناوی (ضیاء الدین)ە لە ساڵی (1255)ی کۆچی هاتوتە دونیاوە لە ساڵی (1318)ی کۆچی وەفاتی کردووە ، بە شیعر هونانديتیەوە و ناردویە بۆ مەلا عەبدواللەی جەلی‌زادەی کۆیی ، وئەویتریان ، وەلامی مەلا عەبدوللەی جەلی‌زادەیە کە لە ساڵی (1260)ی‌کۆچی هاتوتە دونیاوەو لە ساڵی (1326)ی کۆچی ئەم دونیایەی بەجێ هێشتوە .

هەر دوو چامەکان نوسراونەتەوە لە پاڵ کۆمەڵە نامیلکەیێکی ئایینی هەندێکیان بە زمانی عارەبی‌و هەندێکیان بە زمانی فارسین کە لە ساڵی (1290) ی کۆچی نووسراوتەوە ، لە شاری مەدینەی پیرۆز بە دەستی حەسەنی میرغینانی خوقەندی بوخاری ، بۆ مەلا موحەممەدئەمینی حاجی کوردی ولە دوای هەندی نامیلکەکان گەلی پارچە شیعری تریشی نوسراونەوە ، لە شیعرەکانی وەفایی ، شێخ رەزا شێخ عومەری بیارە ، مولانا خالید ، جامی ، سعدی وشاعرانی تر .

لە سەر نامەکەی شێخ عومەر وا نوسراوە : (من جناب ضیاء الدین الشیخ عمر رحمه الله) ولە سەر نامەکەی مەلا عەبدوللە نوسراوە (جواب عالم نحریر جناب فاضل کامل حاجی ملا عبدالله أدام الله ذاته) کە وابی ئەم دوو نامانە لە پاش کۆچی دوایی شێخ عومەرو لە سەر دەمی ژیانی مەلا عەبدوللە نوسراونەتەوە .

کە چی مێژووی نوسینەوەی نامیلکەکانی کە ئەو دوو نامەیان لە پاڵ نوسراونەتەوە لە کاتی ژیانی شێخ عومەردا بووە وجۆری کاغەزو شێوەی نوسین‌و دەستخەتی نامیلکەکان‌و دوو نامەکان زۆر وێك دەچن .

هەر چۆنێ بێت ئەوا هەردو نامە هەڵبەستەکان لە گەڵ وێنەیان دەخەینە بەر چاوی خوێنەرانی بەرێز بۆ ئەوەی تام‌و چێژ لە ماناو ناوەڕوکیان وەرگرن‌و لە شێوەی دەربڕینی هەست‌و بیری ئەم دوو زانایە بەرزانە ئاشنا بن .

**تێبینی :**

**لە بەرئەوەی لەو باوەرە دا بوم کە مەبەس‌و ووشەکانی ئەم دو نامەیە پێویستی‌یان بە شیٰ کردنەوە نیە بۆیە تەنها دەقەکانیانم بلاو کردەوە .**

**نامەی شێخ عومەر :**

دەمێکە کاغەزت نایێتە لامان
عەجەب رژدی لە پەیغام‌و سەلامان
جەلی دایم دەبی جیلوە دیار بێ
لە نێو گێجاوی شەت بێ یا کنار بێ
عومەر عومرێکە بۆ تو ئینتزارە
لە شەوقی تۆ وەکو ئاو بێ قەرارە
حەیاتی من بە یادی تۆ مەنووتە
نەوازش چاوەکەم لایق بە خووتە
دەبو بۆ خاتری تەفریحی یاران
بکەی سەیرو سەفا وەختی بەهاران
ببینی شارەزوری پڕ زەڕو زۆر
بچیتە کێوی هەورامانی پڕ نور
شەوێ تا فەجری سادیق دابنیشی
بە ئومێدی وەفا پا رابکێشی
وەکو ئەم عالیمانە مل بە حەق دەی
هەزار نادان لە پێش شەق‌و لەق دەی
ئیجازەو خرقەو تاج‌و موسەللا
بسێنی بۆ رەواجی کاری دونیا
لە عوقبا گەر بڵێن بۆ چی وەهات کرد
بڵێ دەفعی فەسادم لەم دیهات کرد
منیش بۆ دەفعی ئەم مەنهی قەبیحە

تەلاشم کرد بە ئەلفازی فەسیحە
لە ئەسلی دین‌و ئیمان بێ خەبەر بون
لە حەی‌حەی قال وقەوەل پڕ خەتەر بون
بەسیرەتیان نەبو ڕێی حەق بزانن
حەق‌و باتیل جوێ کەن یا بفامن
ئەگەر من شێخ نەبوم عیلم بە دین بو
موسلمانی‌و شەریعەت لێم یەقین بو
بە حوکمی شەرع‌و حەق لازم وەها بێ
کە ڕەددی جاهیلی نادان کرا بێ
لە تەعلیمی ئوسول‌و فەرعی دینی
لە ئەحکامی شەریعەت ڕێی یەقینی
دریغم لێ نەکردن تا توانیم
نیشانم دان لە پیریم تا جوانیم
بە ئومیدی عەتایی ڕەببی غەفورم
لە بەر تەحقیقی ئەحکام‌و ئوجورم
وەئیللا عالیم‌و عامی‌و مشایخ
هەمو موحتاجی ڕەحمن تیفل‌و ڕاسیخ

**وەڵامی مەلا عەبدوللای جەلیزادە :**

ئەمر نامەت بە دەستی کۆجی موخلیس
گەییشتە دەستی سستی عەبدی موفلیس
لە پاش بۆسیدەن‌و پۆییدەنی تام
نیامە سەر سەرو سەر چاو بە ئیکرام
نیگاهم کرد هەموی لوتف‌و عیتاب بو
بەهەم ئامیزیش قیشرو لوباب بو
سەلامی من چی‌یە ؟ بۆ تۆی بنێرم
ئەتۆ عەزب‌و فورات‌و من سوێرم
جەلی ئیسمم خەفی ڕەسمم دو ڕەنگی
میسالی مەسئەلەی کافورو زەنگی
سوها بێ چارە قوربان چۆن دییارە
کە وەقتی شەعشەعەی شەمس‌ونەهارە
عومەر عومرێکە گەر مەیلی بەلامە ؟
ئەدی بۆ مەرکەزی دەردو بەلامە ؟
ئەتۆ بێ ڕەحم‌و بێ ئینساف‌و بێ باک
وەئیللا من لە بەر پێ تام وەکو خاک
حەیاتی من لە هیجری تۆ مەماتە
عەجاییب نیسبەتێک‌و ئیرتیباتە
هەمو عومرم بە پاییز چو لە هیجران
بەهارم هیچ نەدی بۆ گەشت‌و سەیران
بە قوربان شارەزور چۆن ببینم
زەڕو زۆرم نییە شاقاو هەلینم
لە جێگەی کۆهی هەورامانی پڕ نور
لە سەر کۆهی غەمان کەوتووم وەکو حور
ئەگەر لوتفت هەبێ پێش ڕادەکێشم
لە قافلەی مەتلەب هەر دەم لە پێشم
وەلێ تۆ دەرحەقم بێ ئیلتیفاتی
نیە پەروات بە ئیستیحقاقی زاتی
بە باتین ئەز سوی‌اللهِ‌دەر تەحاشی
بە زاهیر نەجمی‌دینی شێخ‌تەڕاشی
لە بۆی بەعەزێکی نادان‌و نافام
بەجێ بەر شەقی دام ، بەر لە قی دام
ئیجازەو خرقەو تاج‌و موسەللا
بسێنم بۆ ڕەواجی کاری دونیا
فرە خۆشە گەلێ خاسە بە جێیە
وەلێ گەر حەزبکەی ئێرەش ئەوێیە
لە بۆ تو قورب‌و بوعد هەر دو یەکێکە
یەکێ هەمیانە بگرە ئارذی تێکە
ئیجازەم بێ کەرەم کە خرقەو تاج
بنێرە بۆ ڕەواجی ستری باج !
لە بەر شێخان ئەگەر چی دین بڕاوە
بە شیری تۆ زەمانی من بڕاوە
حەقیقەت مایەو دایەی فەسادن
بە فەیزی شەرع‌و عیلم بەد نیهادن
کولی یەکیان قاتیعی ڕێگەن بە جددی
ئەون میسداقی ئایەی لایهیددی
وەلێ بۆ خاتری تۆ بەندەیانم
زوبان دەگرم لە حەقیان تا بتانم
لە پاشی تۆ خودا بۆ خۆی عەلیمە
لە کەرکوکی دوعاگۆی شێخ عەلیمە

بۆژبەیانیم وت ـ کە یەکێك بوو لە ئەندامانی لیژنەی ویژەو کەلەپووری سەر بە دەستەی کوردی کۆڕی زانیاری کە ئەو کتێبەی ئامادەکردبوو ـ : حەیفە بۆ زانایەکی وەك تۆو ئەدەبدۆستو ئەدەبشارەزایەکی وەك کاك حوسێن خانەقا ناوتان بەسەر کتێبی پڕ لە هەڵەیواوە بێ ! مامۆستا کە ئەمەی لێم بیست فەرمانیدا کۆکردنەوەی فۆرمەکانی کتێبەکە ڕاوەستێنن‌و نوسخەیەکی لێ وەرگرت‌و چوو لە سەرەتاوە تا دوایی خوێندیەوە ، ئەو هەڵانەی دەسنیشانکرد کە لە دوو لاپەڕەی دوایی کتێبەکەدا ڕاستکراونەتەوە . تەنانەت ئەو چەند دێڕە بەناو « پەڕیو » ەی لاپەڕەی 151 و 152 ، دوکتۆر ئیحسان فوئاد لەپاش لەچاپدانی کتێبەکە نووسیونی‌و هەروا بەئاسانی بە هەڵەی چاپ دانراون . دەسنووسی کتێبەکە ئێستاش لە چاپخانەی کۆڕەو ، ئەوەی لەم قسانەی من دوودڵە ئەتوانێ بێ تەماشای بکاو بەراوردی هەڵەکان‌و تێکستی دەسنووسەکە بکا . بۆ بەڵگەش لەوە زیاتر ناڵێم کە کێ باوەڕ بەوە ئەکا من تەنانەت ئەوەش نەزانم کە « بەگ » ی کوردی بە « بەك » نانووسرێ ، وەك لە کلیشەی بەرگەکەو لاپەڕە یەك‌و چەند شوێنیتری کتێبەکەدا نووسراوە .

* * *

با بچینەوە سەر ڕەخنەی ئەدەبی‌و ئەنجا لەمەڕ نالی‌یش دوو سێ قسەیەکم هەیە بۆتانی بکەم :

مامۆستا مسعود محمد لە شوێنێکی وتارەکەیا ڕەخنەی لەوە گرتووە کە توێژەرەوەکانی « ئەنجومەنی ئەدیبان » لە هەرکوێ شیعرێکی نالی هاتبێتە ڕێیان ، گەڕاونەتەوە سەر دیوانەکەی نالی کە باوکم‌و فاتیحی برام لێکیاندداوەتەوەو من بەدەم نووسینەوە بۆ چاپ‌و ڕاست کردنەوەی پرۆڤەوە بەسەریا چوومەتەوە . مەبەستی مامۆستا ، وەك خۆی ئەڵێ ، ئەوەیە ئەبوو لیژنە خۆی هەنگاوێکی نوێی لە لێکدانەوەی شیعری نالیدا بۆپێشەوە بنایەو تەنها بەوە دانەکەوتایە کە لێکدانەوەکەی باوکم‌و کاکم بکا بە سەرچاوەی کاری‌و ، ئەو لێکدانەوەیە لەگەڵ بایەخی زۆریشیا ئەوە نی‌یە کە چێکی سپی بۆ ئیمزا بکرێ .

ئەگەر لە بەر ڕووناکیی « ئەبوو وابوایە » سەیری مەسەلەکە بکەین ، بۆمان دەرئەکەوێ ڕەخنەکەی مامۆستا مسعود ڕەخنەیەکی بەجێ‌و تەواوەو ، لەڕاستییشدا نە ئەو شەرحەی باوکم‌و کاکم ئەبێ بە لەوە زیاتر دابنرێ کە هەنگاوێکی یەکەمە بە ڕێگای شارەزاکردنی خوێندەواری کوردا لە شیعری نالی‌و ، نە هیچ لێکدانەوەیەکی‌تریش ئەتوانێ ئیددیعای ئەوە بکا کە ئیتر مەسەلەی لێکدانەوەی نالی تەواو بووەوە بڕاوەتەوە . بەڵکو ، مامۆستا مسعود واتەنی ، « جاری بە کەس نەکراوە بگاتە بنی دەریاو ئەوپەڕی ئاسۆی واتاکانی نالی » ، بەلام کتێبێ ـ مەبەستم « ئەنجومەنی ئەدیبان » ەکەیە ـ ئەو هەموو کون‌و کەلەبەرەی تیابێ کە مامۆستا مسعود پیشانیداون‌و زیاتریش ، لاموایە ئەوە سەروزیادەتی بتوانێ لە لێکدانەوەکانی باوکم‌و کاکم وردبێتەوەو بەوگیانەشەوە لەگەڵ شیعری شاعیرەکانی‌تری ناو کتێبەکەدا مامەڵە بکاو ، سەد بریا مامۆستا مسعود داوای ئەوەی بکردایە توێژەرەوەکانی خۆیان لەگەڵ شیعری شاعیرەکانی‌تریشا کە ناویان تێیدا هاتووە ، ئەوەندە ماندوو بکردایە بگەنەوە بەنیوەی ئەوەدا کە بۆ لێکدانەوەی شیعری نالی لە کتێبەکەی باوکم‌و کاکمیان وەرگرتووە .

بە تێگەیشتنی من مامۆستا مسعود محمد لەم سەردەمەدا سەردەستەی هەموو ئەوانەیە کە لە وردەکاری‌یەکانی شیعری نالی کۆڵیونەتەوەو ئەکۆڵنەوەو باشی بۆ ئەچن[11] بەلام ڕاستیشتان ئەوێ زانینی نالی‌و دۆزینەوەی وردەکاری‌یەکانی ، وەك زانینی قانوونێکی ماتماتیك نی‌یە سنوورێکی دیاری هەبێ‌و لەوێدا ببڕێتەوە . من لە شوێنێکی تریشدا نووسیومە نالی بەجۆرێك یاری بە وشە ئەکاو لە هەر یاری بە وشە کردنێکیشدا مەعنایەکی تازە دێنێتە کایەوە ، وێنەی ئائێستا لای کەس لە ئەدەبی کورددا نەبووبێ ، بەڵکو زۆرجاریش سەرەڕای مەعنا تەواو‌و جوانەکانی گەلێ مەعنای نیوەو ناتەواویش پیشان ئەدا . بۆیەشە زۆرجار نالی‌زان مەعنای ڕاستی‌وای بە خەیاڵدا دێ ، هەرگیز لەوەپێش بە خەیاڵیاو بەڵکو بە خەیاڵی کەسی‌تریشا نەهاتووەو پێش ئەوەش شیعرەکە بێ‌مەعنا یا کەم‌مەعنا ئەبرە ، لای کەمی مەعنایەکی پوختی زانراوی هەر بووە . هەروا شتی ڕاستی‌وایشی لەیادئەچێ کە نەئەبوو لەیادی‌بچێ ، بەلام چونکە مەعنای ڕاست‌و وردی‌تری لەیادە ، بە لەیادچوونی ئەو مەعناکەی‌تر لە زانینی شیعرەکەدا تێ‌نەگیراوە و پەکی‌نەکەوتووە .

بۆیە ڕاست ئەوەیە لە لێکدانەوەی شیعری نالیدا ئەوتاقە مەعنا یا چەند مەعنا زانراوو باوەی هەن ، دانرێن .

هەرچیی‌تریش لەوکاتەدا بەبیردا دێ ئیشارەتی بۆ بکرێ . پاشانیش هەر مەعنایەکی‌تر بە خەیاڵدا هات ، ئەویش بخرێتە سەر کاغەز ، چونکە نالی‌زانی زۆر شارەزایش ناتوانێ بڵێ بەجارێ هەموو ئەو بۆچوونانە ئەزانم کە لەوانەیە مرۆ لە لێکدانەوەی بەیتێکدا بۆیان بچێ .

نموونەیەکی ئەم قسەیەم ئەوەیە کاتێ کە خەریکی نووسینەوەی دیوانی نالی‌یەکەی خۆمان بووم بۆ چاپ ، لە پارچە شیعری :

**جەنانی وەك جینان کردم بە ماوا**
**حەبیبەی ماڵیاوا ، ماڵی ئاوا**

دا بووم ، گەیشتمە بەیتی

**زەفافەتکاهی پەردەی ئاڵی چاوم**
**موبارەك حەجلە بێ بۆ بووك‌و زاوا**

ئەوەم بەبیردا هات کە نالی ئەوەشی مەبەست بووبێ بڵێ :

**موبارەك حەج لەبێ بۆ بووك‌و زاوا**

کەچی ئەو مەعنایەی لە دوایی کتێبەکەوە بۆ :

**حەبیبەی ماڵیاوا ، ماڵی ئاوا**

ئیشارەتم بۆ کردووە کە شاعیری ناسك کاك حەمەعەلی مەدهۆش پێی‌وتم - وەك لەوێدا باسم‌کردووە - هەرگیز نە بە خەیاڵی من‌و نە بە خەیاڵی کەسیشدا نەهاتووە لەوانەی دیوانی نالی‌یان نووسیوەتەوە ، ئەگینا یەکێکیان ئەینووسی « حەبیبەی ماڵی ئاوا .. » ، لەگەڵ ئەوەشا کە هەرکەسێ ئەم بەیتەی خوێندبێتەوە ئەبێ لە دڵی خۆیا وتبێتی : ئاخۆ ئەم (ماڵیاوا) یەی ماڵی (حەبیبەی) یاری نالی لەوێ بووە ، لەکوێ بێ‌و بکەوێتە چ ناوچەیەك ؟

هەروا لە خوێندنەوەی بەیتی

**دەس‌بەندیانە دێن‌و دەچن سەروو نارەوەن**
**یا حەڵقەیانە صوفی‌یی مل‌خوارو مەندەبوور**

دا بەدەم خوێندنەوەی وتارەکەی ماموستا مسعودەوە ، مەعنایەکی‌ترم بۆ (نارەوەن) بە خەیاڵدا هات ، نازانم تائێستا بە خەیاڵی کەسا هاتووە یا نە ؟ بەڵام بێ‌گومان مەعنا پێشووەکەی لای خۆمان جوانتر ئەکا ، وەك چۆن مەعنا تازەکەی ماموستا مسعودیش جوانتر ئەکا ئەگەر بتوانین (دەس‌بەندیانە) بە (دەس‌بەندی یانە) بخوێنینەوە وەك ئەو پێشنیهادی کردووە[12] . ئەو مەعنای‌ترەش کە وتم بەوە ئەبێ (سەروو) بە (سەروی) بخوێنینەوە کە بەهۆی نەبوونی نە (واوی عەتف) و نە (یێی ئیزافە) لە دەسنووسە کۆنەکانا کە بە شێوەی فارسی‌ئامێز نووسراونەتەوە - ڕێی‌تێ‌ئەچێ‌و نارەوا نابێ‌و ، (نارەوەن) یش بە (نارەوەن = نارەوەند) بخوێنینەوە ، واتە : دار سەروەکان کە لەجێی خۆیانا چەقیون‌و نارۆن‌و نابزوێن ، بە ڕیز وەك هەڵپەڕکێ‌کەر کە دەسیان بە دەسی یەکەوە ئەگرن‌و توند ئەکەن ، یا وەك دەس‌بەسراو ، دێن‌و ئەچن .

بگەڕێینەوە دواوە بۆسەر ئەوەی کە وتمان زۆرجار وائەبێ مرۆ ڕێی لە مەعنایەك ناکەوێ کە ئەبوو بیزانیایەو بەئاسانی ڕێی لێ بکەوتایە .

من خۆم هەر لە منالی‌یەوە کە گوڵستانی سەعدیم خوێندووە ، ئەو چوارینەیەم ئاگا لێیە کە ئەڵێ :

**ابر اگر آب زندگی بارد**
**هرگز از شاخ بید بر نخوری**
**با فرومایه روزگار مبر**
**کز نی بوریا شکر نخوری**

کەچی ، وەك ماموستا مسعودیش لە وتارەکەیا ئیشارەتی بۆ کردووە ، تا لە چاپکردنی ئەسڵی دیوانەکە نەبووینەوەو ماموستا مسعود لە دانیشتنێکا باسی مەعنای (بووریا) و یاری بە وشەکردنی نێوان (بووریا) و (بۆریا) ی نەکرد ، من نەکەوتەوە یادم کە بووریا ئەو قامیشەیە چیغی لێ دروست ئەکەن . ئەگەر خۆم پێش‌وەخت ئەوەم بکەوتایەتەوە یاد ، یا ماموستا مسعود ئەو باسەی پێش سەرەی چاپ هاتنی بەیتەکەی نالی بکردایە ، یا کەسێکی‌تر زوو پێی‌بوتمایە ، لە ئەسڵی دیوانەکەدا کەڵکم لێ وەرئەگرت‌و بەوە مەعنایەکی جوانی‌تریشم لە جێی خۆیا ئەخستە بەردەستی خوێندەواران ، وەك لە (ڕیا) ی دواوشەی نیوەی دووهەمی بەیتەکەدا کراوە[13] .

* * *

لە داوێنی ئەم چەند لاپەڕەوە ، ئەمەوێ لایەکی بەپەلەیش لە باسەکەی «شاعیرەکانمان» و هەڵسەنگاندنەکەی بکەمەوەو ، پڕبەدڵ پیرۆزبایی ئەو داکۆکی‌یە بەجێ‌و ڕاست‌و دروستەی ماموستا مسعود بکەم کە لە شیعری نالی‌و تێکڕای شیعری ڕەسەن‌و سەربەرزی کوردیی

کردووه ، بەرانبەر بە رەخنەکانی ئەمین فەیزی بەگو شالاوه ـهەق و نانەتەوەییەکەی خاوەنی وتاری «شاعیرەکانمان»و بە ـرەنگی دلێری کۆڕی رەخنەسازیی کوردی» دانانی ئەو شالاوه .

مەحوی‌و سالم‌و کوردی‌و نالی‌و ناری‌و زێوەرو حەمدی‌و موختار ، کە بۆنموونە خاوەنی ئەو وتارە هەرەشەی یەکالاکردنەوەی لێ کردوون ، هیچیان ئەوەندەی بارو دۆخی ژیانیان هوشیاریی پێ بەخشیون ، «فێڵی لە جەماوەری نەتەوەکەی نەکردووە و «ڕاستیی لێ نەشاردووەتەوە» ، «حەقیقەتی مێژوویی‌و شارستانەتی‌و ڕۆشنبیریی لێ ون نەکردووە» ، بەڵکو هەرکامیان بگری ، بە سەنگو ترازووی سەردەمی خۆی‌و کوردستانی ئەو سەردەمەی ، هەوڵی ئەوەی داوە «جەماوەر خۆی بناسێ»و «ڕێگای بەرژەوەندی خۆی بگرێتەبەر» و «هەمووشتێك بە ناوی خۆیەوە ناوبەرێ» .

بەلام با بڵێین بنووسی نادیاری «شاعیرەکانمان» لەو سەردەمەدا کە کڵۆلیی گەلەکەی بە چاو ئەبینێ‌و هۆیەکەی نازانێ ، لە شاعیری داماو بەولاوه کەسی لە بەردەستا نابێ داری کینەی خۆی بەسەریا بشکێنێتەوه ، بەلام ئەی ڕۆشنبیری ئەم دواسالانەی سەدەی بیستەم ، بە چ‌عوزرو بیانوویەکەوه دێت ئەیەوێ ئەو چەردە کەلەپوورەشمان کە بە هەزار دەردو مەینەت‌و کوێرەوەری لە چنگ زەبرو زەنگی گەردوون ڕزگاری بووه ، بە هیچ‌و پووچ دەرکاو ، شاعیرەکانمان بەو تۆمەتانە گوناهبار ئەکا کە تۆزێ پێشتر لە زمانی خۆیەوه گێڕامانەوه ؟ . بۆ ئەو داوایە لە خۆی ناکاو ، بۆ لەجیاتیی ئەوەی سووژنێ بە چاوی خەڵکا بکا ، دەرزی‌یەك بە لووتی خۆیا ناکا ؟ بۆ ؟ !

**پەراوێز** :

(1) یادگاری لاوان ، بەغدا ، 1933 ، ل 33 — 45 ، چاپخانەی کەرخ .

(2) گۆڤاری کۆڕی زانیاری عێراق ، وتاری «ڕەخنەسازێك‌و بیردۆزی هۆنراوه» ، بەرگی دەهەم 1983 ، ل 3 — 41 .

(3) بڕوانەره : مەلا عبدالکریمی مدرس ، یادی مەردان ، بەرگی دووهەم ، ل 315 .

(4) لام‌وایە جێی خۆی بێ لێرەدا سوپاسی مامۆستا مەلا جەمیلی ڕۆژبەیانی بکەم کە هەڵەیەکی بۆ ڕاستکردینەوه لە بەرگی یەکەمی یادی مەرداندا ڕووی‌داوەو لە لاپەڕە 668ی بەرگی دووهەمیدا دەسنیشانمان کردووه .

(5) بڕوانەره : مەلا عبدالکریمی مدرس ، سەرچاوەی پێشوو ، ل 175 .

(6) سەرچاوەی پێشوو ، ل 506 — 508 .

(7) محمدی مەلاکریم : حاجی قادری کۆیی شاعیری قۆناغێکی نوێیە لە ژیانی نەتەوەی کورد ، بەغدا ، چاپخانەی نەجاح (1960) .

(8) ئەمین فەیضی بەك ، ئەنجومەنی ئەدیبان ، تۆژینەوەی لیژنەی وێژەو کەلەپوور ، چاپخانەی کۆڕی زانیاری عێراق ، بەغدا ، 1983 .

(9) گەلالەی وتارێکی درێژم ئامادە کردووە بە ناوونیشانی «ئەنجومەنی ئەدیبانی ئەمین فەیزی بەگ لە ئەنجومەنی ئەدیبانی دەستەی کوردی سەر بە کۆڕی زانیاری عێراقدا» هەموو ئەو هەڵە جۆربەجۆرانەی تیا یەکالا ئەکەمەوه کە لەو کتێبەدا کراون . ئومێدم‌وایە بتوانم بەم‌نزیکانە بلاوی بکەمەوه .

(10) لام‌وایە ئەگەر لەناو ڕۆشنبیران‌و بنووسانی کورددا کەسانێك هەبن بکەونە پەیجۆری شێوه نووسین‌و داڕشتنی بنووسانی ئەم سەردەمەی کورد ، ئەتوانن جێ‌پەنجەی من بە نووسینی گەلێ لەوانەوه ببیننەوه کە دەستەی کوردی کۆڕی زانیاریی عێراق‌و کۆڕی زانیاریی کوردی جاران ، بەرهەمی بۆ لەچاپ‌داون .

(11) خۆزگە مامۆستا مسعود محمد شانی ئەدایە بەر لێکدانەوەیەکی نوێی سەرجەمی شیعرەکانی نالی ، بەمەرجێ لێکدانەوەکەی تەنها تەرخان بێ بۆ شیعری نالی .

(12) دوودڵیم لە گونجانی بۆچوونەکەی مامۆستا مسعود لەوەوەیە ئەگەر لەجیاتیی (دەس‌بەندیانە) ، (دەس‌بەندی‌یانە) بخوێنینەوه بەمەعنای وەك دەس‌بەسراو ، ئەبوو بووترایە (دەس‌بەندانە) چونکە لەوحالەدا ئەو (ی)ی دوای (بەند)ه پێویست نابێ .

(13) لە ئاخری کتێبەکەوه ، لە لاپەڕە 739دا ئەم واتایەش لێکدراوەتەوه .



مەغدید حاجی

لە بارو دۆخی ئێستای کاروانی رۆشنبیری کوردیماندا هونەری شانۆ رۆڵێکی گرنگو کاریگەر لە رێرەوی کاروانەکەدا دەگێرێت .

هەروا هونەری شانۆ لە ریزی پێشەوەی هونەرە جوانەکانی تردا دەوەستێت لە بواری کارتیکردنە سەر جەماوەرو شوشیار کردنەوەی .

جا بۆیە نووسین دەربارەی شانۆی کوردیمان زۆر هەڵدەگرێتو گەلێك لقی لێ دەبیتەوە .. ئێمەیش لەم وتارەماندا لە چەند مەسەلەیەکی گرنگی پەیوەندی دار بەم هونەرە زیندووو هەمیشە کاریگەرە لە لای خۆماندا دەدوێین .

● رەخنەو رەخنەی شانۆیی :

سەرەرای لێکۆڵینەوەی زۆرو لێدووانو فرە نووسین دەربارەی رەخنە بە شێوەیەکی گشتیو لقەکانی بە شێوەیەکی تایبەتی لە بووارە رۆشنبیری یە جۆر بەجۆرەکانماندا کارێکی ئاسایی یە کە بیرو رای هەموو نووسەرو رەخنەگرەکان لە بارەی رێبازێکی تایبەتی لە رەخنەسازیدا یەك نەگرێتەوە . بێ شك ئەمەش نیشانەی پەرەسەندنو بزووتنەوەی رێرەوی رۆشنبیری کوردی هاوچەرخمانو بەرەو پێشەوە چوونیەتی .

راستە هەموو لایەکمان هەست بە گەلێك دیاردەی زیان بەخشو چەوت دەکەین لە بواری رەخنەسازی داو ئەم دیاردانەش تەنیا لە شێوەی رووکاریو رای سەرپێیی دەربرین خۆیان نانوێنن و بەس بەلکو هۆی تایبەتیو پەیوەندی دۆستایەتی یان ناحەزی نێوان رەخنەگرو خاوەن بەرهەمی رەخنە لێگیراودا یا بەزەیی هاتنەوە بە دەقی ئەدەبی .. هتد کار دەکەنە سەر میزاجی هەندێك لە رەخنەگرەکانمانو دەیانکەنە سەنگی مەحەك . بێگومان ئەنجامی ئەمەش هەمووی بە زیان بۆ سەر ئەدەبەکەمانو بزووتنەوەی رەخنەسازی کوردیدا دەگەرێتەوە .

لەبارەی رەخنەو لقەکانی یەوە ئێمە لێرەدا مەبەستمان رەخنەی شانۆییو رەخنەگرتن لە رەخنەی شانۆیی یە کە

پەیوەندییان لە لایەکەوە بە رەخنەی ئەدەبییەوە هەیە لە لایەکی تریشەوە بە لقێك لە رەخنەی هونەری دەدرێتە قەڵەم .

زۆر جار دەبینین یا دەبیستین کە نووسەرێك وتارێکی رەخنەیی دەربارەی شانۆگەرییەکی پێشکەشکراو لە گۆڤارێکدا بڵاو دەکاتەوە چەند کەسێکی لێ دێنە وەڵام و گلەیی دەربرین .. بە تایبەتی لە ریزی ئەو هونەرمەندانەی کە بەشدارییان لە پێشکەشکردنی بەرهەمە رەخنە لێگیراوەکە کردووە بە نیازی گوایە بەرگری کردن لە خۆیان و شکاندنەوەی خاوەن رەخنەکە کە دیارە بە دڵیان نەبووەو زۆر ستایشی نەکردوون و ! هەندێك جاریش دەڵێن خاوەن رەخنەکە هەموو مەرجەکانی رەخنەگری هونەری پسپۆری تیا بەدی ناکرێ و شارەزایییەکی ووردیشی لە هەموو کون و کەلەبەرو لایەنەکانی ! هونەری شانۆدا نییە بۆیە رەخنەکەی رەت دەکەینەوە ! .

ئەمەو لە کاتێکدا بزووتنەوەی شانۆی کوردیمان لە بارو دۆخی ئێستایدا پێویستی بە سەرنج و بیروڕاو رەخنەی دروستکەری هەموو دڵسۆزانی هەیەو بە هیچ شێوەیەك رەوا نییە کە دیاردەی نەبوونی یا کەمی رەخنەگری هونەری پسپۆری ئەم بوارە لە گۆڕەپانی رەخنەسازی کوردیماندا رێگا لە هەر بینەرێکی خاوەن قەڵەمی دڵسۆزو هوشیار بگرێت کە بیەوێ بە وتارو سەرنج و بیرو رای رەخنەگرانە لە سەر لاپەڕەی گۆڤارو رۆژنامەکانماندا شانۆگەرییە پێشکەشکراوەکان هەڵبسەنگێنێت .

خۆ ئەگەر [illegible]ات و سەرنج و بیرو راو توانای هەموو لایەکیش دەربارەی بەرهەمێکی پێشکەشکراو یەکیان نەگرتەوەو چۆن یەك نەبوون ئەمەشیان کارێکی ئاسایییەو دیارە نیشانەی زیندوویی و بزووتنەوەی ژیانی کۆمەلایەتی و رۆشنبیریمانە .

● **نووسین و وەرگێرانی دەقی شانۆیی :**

ئاشکرایە کە هەبوونی دەقی شانۆیی بە نرخ مەرجێکی بنەرەتییە بۆ پەرەسەندن و سەلماندن و بوونی شانۆی کوردیمان .

. تا چەند ساڵێکی کەم لەمەوبەر کەمی دەقی خۆماڵی و وەرگێردراو کۆسپێکی گەورەی بەردەم بەرەو پێشەوە چوونی ئەم بوارە رۆشنبیرییە پێشەنگەبوو . بەلام جێگای خۆشحاڵییە کە لە سەرەتای حەفتاکان بەملاوە هەست بە بایەخدان بە نووسینی چیرۆکی شانۆیی خۆماڵی و وەرگێرانی دەقی جیهانی سەرکەوتوو بۆ سەر زمانی کوردی دەکرێت و کۆمەڵێك چیرۆكنووس و نووسەر ئەسپی خۆیان لەم بوارەدا تاوداوەو بەرهەمی سەرکەوتووشیان وەدەست داوە .

هەروا دیاردەیەکی دڵخۆشکەرەوەی تر لەم میانەدا هەست پێ دەکرێت کە ئەویش هەوڵدانی کەلك وەرگرتنە لە فۆلکلۆرو کەلەپووری نەتەوایەتیمان بۆ نووسین و ئامادەکردنی دەقی خۆماڵی رەسەن لە لایەن هەندێك لە برا دەرهێنەرەکان و نووسەرەکانمانەوە ، ئەم جۆرە هەوڵدانەش لە یەك کاتدا چەند ئەنجامێکی چاك وەدەست دەدات وەکو :

1 ـ ئاوڕ دانەوە لە کەلەپووری نەتەوەکەمان و مامەڵەکردن لە گەڵیدا وەکو سەرچاوەیەکی دەوڵەمەند بۆ دارشتنی بەرهەمی ئەدەبی رەسەن .

2 ـ پاراستن و نەفەوتان و فەرامۆش نەکردنی کەلەپوورو فۆلکلۆرو زیندو کردنەوەیان و ناساندنیان بە نەوەکانی ئیمڕۆو دووا رۆژ .

3 ـ دەرهێنەرێك کە دەقێکی شانۆیی لە بەرهەمێکی فۆلکلۆرییەوە ئامادە دەکات یا پشت بە بابەتێکی فۆلکلۆری دەبەستێت وەکو سەرچاوە بۆ نووسینی چیرۆکێکی شانۆیی یا شانۆگەری یەك ، دەزانێ چۆن نووسینەکەی وابێنێتە بەرهەم کە بۆ پێشکەشکردنی لە سەر شانۆ بگونجێت و حیوارو سیناریۆو مەرجە هونەرییەکانی تری نووسینی شانۆیی تیا دا برەخسێنێت هەروا لە رووی هەڵبژاردنیشەوە دەزانێ چ جۆرە بابەتێك هەڵبژێرێت و بینووسێتەوە ..

4 ـ لە ئەنجامیشدا کۆمەڵێك چیرۆکی شانۆیی لە بەری رەنجی برا دەرهێنەرەکانمان دەکەونە کتێبخانەی کوردییەوە .

گۆڤارەکانی (رۆژی کوردستان)و (بەیان)و (کاروان) یش لە بواری خزمەتکردنی شانۆی کوردیماندا لەم سالانەی دواییدا سەرو ژمارەیەکیان بۆ شانۆ تەرخان کردووەو کۆمەلێك دەقی خۆمالی و بیانی وەرگێردراویان خستۆتە بەر دەستی تیپە هونەریەکانمان کە تاکو ئێستا زۆریان دەرهێنراون و لەسەر شانۆکانی کوردستان و شاشەی تەلەفزیۆنی تەئمیمدا پێشکەش کراون .

مەسەلەی بایەخ دانیش بە وەرگێرانی دەقی جیهانی بۆ سەر زمانی کوردی هەر لە سەرەتاوە لە لایەن نووسەرو وەرگێرەکانمانەوە تا رادەیەك بایەخی پێ دراوەو پێشکەش کردنی دەقی جیهانیش لەسەر شانۆکانماندا بوتە هۆیەکی کاریگەر لە پێناوی ئاشناکردنی بینەرانمان بە دەقی شانۆیی جیهانی و موتوربەکردنی بەرهەمە هونەریەکانمان بە بابەتی مرۆڤایەتی کەلە پێشکەوتوو ئازادیخوازەکانی جیهان .

لەم رووەوەش پێویستە سەری رێزو خۆشەویستی بۆ تیپە شانۆییەکانی شاری سلێمانی دابنەوێنین کە لە بواری پێشکەش کردنی دەقی جیهانی سەرکەوتوودا دەوری پێشەنگیان گێراوەو لە ماوەی دوازدە سالی رابوردوودا زیاتر لە سی (30) دەقی جیهانی پەسندکراویان لەسەر شانۆکانی شاری سلێمانیدا پێشکەش کردووە کە دیارترینیان ئەمانەن :

1 - شایی خوێناوی ، نووسینی لۆرکا وەرگێرانی شێرکۆ بێکەس و دەرهێنانی نوزاد مجید .

2 - نرخی ئازادی ، نووسینی عمانوئیل روبلس وەرگێرانی طالب بەرزنجی و دەرهێنانی غازی بامەرنی .

3 - پیسکەی تەرپیر ، نووسینی مۆلێر وەرگێرانی نوری وەشتی و دەرهێنانی ئەحمەد سالار .

4 - جەنابی موفەتیش ، نووسینی گۆگۆل ئامادەکردنی رؤوف حسن و دەرهێنانی ئەحمەد سالار .

5 - دکتوری تێلا ، نووسینی مۆلێر ئامادەکردن و وەرگێرانی رەفیق چالاك و دەرهێنانی عبدول حمە جوان .

6 - تەنەکە ، نووسینی یەشار کەمال ئامادەکردنی فؤاد مجید میسری و وەرگێرانی شکر مصطفی و دەرهێنانی ئەحمەد سالار .

7 - هاوارێکی تاساو ، نووسینی دستوفسکی ئامادەکردن و دەرهێنانی جەلیل زەنگەنە .

8 - راستیەکە مرد ، نووسینی عمانوئیل روبلس وەرگێرانی ئازاد حمە بچکۆل و دەرهێنانی عوسمان چێوار .

9 - خوازبینی ، نووسینی ماکس رینیە وەرگێرانی پشکۆ ئاکام دەرهێنانی تەها خەلیل .

10 - شیرین و فەرهاد ، نووسینی نازم حیکمەت وەرگێرانی عومەر عەلی ئەمین و دەرهێنانی جەلیل زەنگەنە[1] .

بەلام هەر لە بارەی وەرگێران و پێشکەش کردنی دەقی جیهانییەوە دەمانەوێ گلەییەکی دۆستانەش لە هەندێك لە تیپە شانۆییەکان و برا رۆژنامە نووسەکانمان بکەین ، چونکە دەبینین هەندێك جار کە شانۆگەرییەکی وەرگێردراو پێشکەش دەکرێت لە کاتی پڕو پاگەندەکردن بۆ بەرهەمەکەو لە سەر نووسینی لە گۆڤارو رۆژنامەکانماندا ناوی وەرگێری شانۆگەرییەکە پشتگوێ دەخرێت و تەنیا بە ناو هێنانی نووسەرە بیانییەکەو دەرهێنەرەکەی دەوەستن ..

ئەمەو لە کاتێکدا ئەگەر بێت و هەلبژاردن و وەرگێران و بلاوکردنەوەی وەرگێرەکانی لای خۆمان نەبوونایە بۆ ئەم بەرهەمانەی کە وەریان دەگێرن و بلاویان دەکەنەوە شانۆی کوردیمان بەردەوام بە دەست نەبوونی دەقی وەرگێردراوی جیهانییەوە دەینالاند و هەول و تەقەللای ئەم وەرگێرانەش هیچی لە هەول و تەقەللای نووسەرە بیانییەکان کەمتر نییە بۆ شانۆی کوردیمان جا بۆ ناویان لە گەل ناوی ئەواندا نەیەت و رێزی هەردوو لایان وەکو یەکتری نەگیرێت ؟ .

● **بەرەو پێکەیاندنی بینەری راستەقینەی شانۆ .. :**

بینەران مەودای سێیەمی سەرەکی شانۆ پێك دەهێنن لە دوای دەق و ، شانۆو ئەوەی لەسەر شانۆدا پێشکەش دەکرێت هەروا بینەران و شانۆ هەر لایەکیان تەواوکەری لایەکەی تریانەو هیچ کامێکیان بێ ئەوی‌تر بایەخ و بوونی نابێت .

دەوڵەمەندیی و پەرەسەندویی شانۆش دەوڵەمەندیی و پەرەسەندویی بینەران دەگەیەنێت و پێچەوانەی ئەم بۆچوونەش راست دەردەچێت .

بۆیە هەر هەوڵدانێك بەرەو خولقاندن و پێگەیاندنی بینەری راستەقینە لە شانۆی کوردی‌ماندا دەبێ لە سەرەتاوە بە هەوڵدان و خزمەتکردنی راستەقینەی شانۆی نەتەوایەتیمانەوە دەست پێ بکات ..

بەلام سەرەڕای بایەخ و گرنگی پەیرەوکردنی ئەم راستی‌یەی سەرەوە پێویستە بینەری کورد لە شانۆدا :

1 ـ بە هۆش مامەڵە لە گەڵ ئەم بەرهەمە شانۆگەری‌یەدا بکات کە دەی‌بینی نەك بەسۆز ..

2 ـ هەوڵی کەلك وەرگرتن بدات لەو شانۆگەری‌یەی کە ماوەی یەك دوو سەعات لە هۆڵێکی ساردو سوڕ لە زستاناو گەرم و دووکەڵاویش لە هاویندا لە بەرامبەری دادەنیشێت ! .

3 ـ بە وێنەی رەخنەگر بڕوانێتە هەر بەرهەمێکی شانۆیی و یارمەتی دەرهێنەرو ئەکتەرەکان بدات لە راست کردنەوەی هەڵەو ناتەواوی‌یەکان و پیرۆزبایی سەرکەوتنەکانیشیان لێ بکات و چەپکە گوڵی خۆشەویستی و رێزلێنان لە گەڵ خۆیدا بەرێت و لە دوای کۆتایی پێ هاتنی هەر شانۆگەری‌یەکی سەرکەوتوو پێشکەش بە دەرهێنەرو ئەکتەرەکانی بکات .

4 ـ پێویستە برا دەرهێنەرەکانیشمان هەوڵی بزواندنی چەپڵەی بینەران و خولقاندنی پێکەنینی زیان بەخش نەدەن لە رێگای پێشکەش‌کردنی هەندێك بەرهەمی میللی و فۆلکلۆری تراژیدی یا کۆمیدی رادەنزم لە رووی دارشتنی هونەری و ناوەرۆکی بابەتەکانیان و شێوە دەرهێنانی سۆز بزوێنی چەپڵەو هەرا خولقێن ، یا فرمێسك پێ هەڵوەراندنی تەماشاکەران و هەوڵدان بۆ راکێشانی زۆرترین ژمارەیان بۆ ناو هۆڵی شانۆکانی لەم بابەتانەیاندا لەسەر حیسابی پێشکەش‌کردنی بەرهەمی رادەبەرز لە رووی ناوەرۆکی شۆڕشگێڕانەی دەقەکان و دەرهێنانی داهێنەرانەو هەڵبژاردنی ئەکتەری بە توانا ..

بەکورتی دەڵێم پێویستە برا دەرهێنەرەکانمان لەم جۆرە بەرهەمانەیاندا هەوڵ بدەن زیاتر لە گەڵ هۆشی بینەراندا بدوێن نەك هەمیشە هەر لە تەلەکانی سۆزیان بدەن و فرمێسکیان لە چاواندا هەڵبوەرێنن یان بە هۆی خولقاندنی دیمەنی کۆمیدی رووت لە دەریای پێکەنینیان نقووم بکەن و لە هۆش خۆیان بەرنەوە .. تاکو شانۆکەمان ببێتە خاوەنی بینەری راستەقینەی خۆی و بتوانێت بە رۆڵی فێرگەو مامۆستای سەرکەوتووی کۆمەڵ هەڵبستێت .

هەر لەم رووەوەش هەقمانە گلەییکی برایانە لە بەشێکی بینەرانمان بکەین کە لە کاتی پێشکەش‌کردنی هەندێ شانۆگەری .. لە ناو هۆڵی شانۆکاندا دەیکەنە فیکەکێشان و چەپڵەلێدانی نادروست و زیان‌بەخش . جاری‌وایش هەیە قاقای پێکەنینیان دەنگ‌دەداتەوە ..

جا ئەم بینەرانە بەم جۆرە هەڵس‌وکەوتانەیاندا لە لایەك سەر لە بینەرانی‌تر .. ئەوانەی بە نیازی کەلك‌وەرگرتن سەیری بەرهەمەکان دەکەن ، دەشێوێنن و لە لایەکی تریشەوە دەیسەلمێنن کە تەنیا بۆ رابواردن و وەخت‌کوشتن بۆ بینینی شانۆگەریەکان دەچن .

لەم بارەیەوە دەمەوێ لە دووای [ئەکتەرێکی کورد] ەوە دووبارە پەنجە بۆ وتەیەکی بەنرخی بریخت رابکێشم کە گوتوویەتی :

[هەندێك لە بینەران کە دێنە بینینی شانۆگەری‌یەك وا دەزانن ئەو پارەیەی دەیدەنە بلیتەکە داویانە بە بۆینباغێك ، کراسێك ، شتێك لەو بابەتە .. تەنیا وەخت کوشتن گرنگە لایان . ئەمانە مەرفووزن لە شانۆدا بەلام هەندێکی کە دێنە هۆڵی شانۆیەکەوە بۆ ئەوەی جەنگێك لە هۆشیاندا بەرپابکەن ، دمیانەوێ لە عەقلەوە بڕواننە ئەو بەرهەمەو خۆشیان . ئەمانە بینەری راستەقینەن](2) .

پەراوێزەکان :

(1) ـ شانۆ . بلاوکراوەیەکی نەقابەی هونەرمەندانی سلێمانی‌یە لە ساڵی 1988دا دەرچووە . ل 52 تاکو 58 . دەستەی نووسەرانی ئەم بلاوکراوەیە لەم بەرێزانە پێك هاتووە : 1 ـ کاوەی ئەحمەد میرزا 2 ـ جەوهەر دڵپاك 3 ـ آزاد جلال 4 ـ عبدول حەمەجوان .

(2) ئەکتەرێکی کورد . بینەر لە شانۆی کوردیماندا . پاشکۆی رۆژنامەی عیراق . ژمارە 17 تەمموزی 1978 .

دیوانی کاروان

بۆ گیانی پاکی نەمری مامۆستا (ڕەفیق حیلمی)

# چەپکە گوڵ

د. نەسرین فەخری

نە ئاخ ، نە ناڵە
نە گریان
ناخەمە پێش خۆم
بۆ سەیوان
بەڵام بە چەپکە
گوڵ ئەبەم
لە شیعری خانی
«زین و مەم»
چەپکە گوڵی
ناسك و وورد
پشکووتوو بە خوێناوی کورد
چەپکە لەو باغە پیرۆزە
کە ناوی جەژنی نەورۆزە
لەو هیوایەی دڵی «کۆیی»
ئاوی دا تاکو پێگەیی
«بێکەس» ، کەسی هەموو کەسێك
کە هەیبو تەنیا مەبەستێك
ڕاستی ، یەکگرتن ، تێکۆشان
بۆ خۆمان و بۆگشت گەلان
ئاوازی «ئەرەغۆن»ی کورد
گەرم و قووڵ و ساکار و وورد
چونکە دڵی کوردستانە
سەرچاوەی گشت
ئەو بەستانە

* * *

ئەگەر هاتیشە خوار
لە چاو
جار بە جار
فرمێسکی بە تاو
گەش و گەرم و
بە جۆش و ڕوون
بە بەرزایی «پیرەمەگروون»
ئەو لە جێگەی زمان
بە چاو
پێشکەش دەکات
هەزار سڵاو
ئەوی لەیادی ئەکەم تۆی
هەر بەو جۆرەم
تێم گەیشتووی
بۆیە نە ناڵە و نە گریان
لەگەڵ خۆم نابەم بۆ :
«سەیوان»
بەڵام بە باوەش گوڵ ئەبەم
لە «هیوا» تا :
پێشکەشتی کەم

* * *

## عەشقت نامۆیەکە

...اشقی تۆم
...ەر چەند عەشقت
...شتێکی یەکجار بێ چارەیە
عەشقێکە ڕێی پێ نادرێ
باوەڕ نامەشی نادرێتێ و
کەسیش نەیدانێ پیایی
نامۆیەکە
دڵم ئەڵێ
کەس نییە ڕوویەکی تازەی پێدانێ
هەموو ڕۆژێ ئەرد یارانی دڵم ئەگرێ
لەبەر ئەوەی ڕووت ئەزانێ
دار و دیواری شارەکە
بوونە چاوی پاساوان و پشکنی و
ئەپانەوڕێ
سام بنیشە بەر چاوەکانم و
لە ئاستی دیداری تۆدا سەرمای دابێ
بەڵام کە دێیت هەر وەکو جۆر
ئاسمانی شار
ئەستێرەیەکی نامێنێ
بە تەنها ڕووت گەش گەش ئەگرێ
تەنها شتێکی ئەزانم
دڵ عاشقتە و
عەشقیشت ڕێی پێ نەدراوە

* * *

بە تەنها تۆ لە من ئەچی
بە تەنهاش من لە تۆ ئەچم
بۆیە هەردوو
مل ڕێگەی هەورازێکی بێ لوتکەمان
گرتووەتە بەر
بۆیە هەردوو
لە دەریای چاوی یەکترا
نوقم ئەبین و ئاخنکێین
ئەوینمان زمانێکە
تەنیا هەردووکمان تێی ئەگەین

## بۆ كوێ ئەڕۆی ؟

پیربال محمود
ڕواندوز : 1957

سروشت تۆراوە ،
لە هەموو لاوە ...
باوو گەرداوە ...
بەم ڕۆژە ، بەم دانە زووە
كێ لە ماڵی خۆی دەرچووە ؟
بۆ كوێ ئەڕۆی ئەی شیرین ،
ئەی پەری پەرچەم زێڕین !
هەتاكو مەل ،
بێچووی غەزەل ،
بەپەلە پەل ..
هەڵفڕی لە چیمەنزاری ،
گەڕاوە هێلانەی تاری ...
بۆ كوێ ئەڕۆی ئەی شیرین ،
ئەی پەری پەرچەم زێڕین !

قامكی گەرداو
ئەخاتە چاو ...
دووقاچی خاو
دیارئەخا پووزی گەرم
داپۆشراو بەبەرگی نەرم
بوكوێ ئەڕۆی ئەی شیرین ،
ئەی پەری پەرچەم زێڕین !
ئەم خانووە ،
قیتو نووە ...
رووی لە تووە ،
بێ بخەوە لە ژێر بانی ،
ئەم شەوە تاكو بەیانی ،
بۆ كوێ ئەڕۆی ئەی شیرین ،
ئەی پەری پەرچەم زێڕین ؟

لە گەمبۆلان ،
لە با دۆلان ،
لە چنگ زۆلان ...
ئەتپارێزی لەشەوە زەنگ ،
لە درندەو گورگی نەهەنگ ...
بۆ كوێ ئەڕۆی ئەی شیرین ،
ئەی پەری پەرچەم زێڕین ؟
لێرە خەندان ،
لای ئاگردان ،
تاكو بانگدان ...
لوولت ئەدا لە پاڵ سەرم
هەناسەی گیانو جگەرم
بۆ كوێ ئەڕۆی ئەی شیرین !
ئەی پەری پەرچەم زێڕین ؟

## بووكی چیا

محمد حسین هەڵەبجەیی

لەگەڵ بەهارا دەركەوتی
هەرچی گوڵاڵەی چاو ڕەشی
نسارو پێدەشتەكانە
دەبێ بێنو ..
پەنا بۆ چاوی تۆ بەرن
لەبەر سووری هەر دوو گۆنات
دەشكێنەوەو دەژاكێنو
هەڵدەوەرن

* * *

لەگەڵ گەرمەسێری هاوینا
كە دەركەوتی
گوڵە گەنمە زەردەكان
لەتەك پرچی زەردی تۆدا
سەما دەكەن
ڕەوە كچی جوتیارەكان
دەرژێنە نێو گەنمە جارو
تۆش وەك ئەوان
بۆنی گوڵە گەنم دەكەی
تۆش داست بە دەستەوەیە
بە نێو خەرمەنی گەنمدا
دێیتو دەچی
چەندە جوانی .. !
بە كچە جوتیارێك دەچی

* * *

لەگەڵ پایزا دەركەوتی
سرووەت نایە
سرووەت سرووەی
دەنگی دارستانو بایە
درەختە باڵا بەرزەكان
كاتێ باڵای تۆ دەبینن
دەكەونە گەلاڕێزان
پرچو لقو بۆپیان دەرنن

* * *

لە زستانا ، تۆ فریشتەی
تۆ خوای جوانیت
تۆ بارانێكی دەبارێیت
نمەی باران ..
بۆ نسارو پێ دەشتەكان
تۆ وەك كلوی بەفری سپی
ئەم وەرزە وای
كراسێكی سپی ڕەنگی
بۆ باڵای درەختەكانی زەردی پایز
ئەی (ئەفرۆدێت) ، تۆ لەگیانی
گشت عاشقێكی ماندوو دای
بووكی ئازیز
لەگەڵ هەموو
وەرزێكدا تۆ ، بووكی چیای

«نامەیا گەنجەکێ مەهابادێ
بو (مەحمود دەرویش)ێ»

# ژبیر خونەبە

● حکمت محمد هروری ●
دهوک

مەحمود دەروێش
دوزا من و تە درێژ بو
ئەم خودانێن سوزو باوەرێن ژیانێ
دژمن ژی بێ لوێ هیڤیێ
سەرێت دو بەرانا ئیرو
د دیزا دلێ مەدا بکەلێن
پەیڤێن شعرێت مە ب دزن
زەیتێن و کەڤوتێن حەیڤاو ...
لات چیایت مهابادێ
خەملا بهارێ نەکن بهەژن
ئەو زاروکێن بێ دایك و باب
بو ژینێ جار نە گرنژن
ئەو بەگلەرو ئاغا دیسا
هەژار دڤێ هەر بن دەست بن
قەلەمێن گازی کەن هەر
ڤا هەوارێن بێ دەنگ ڤەدان
شعرێن مە نالین و گیرین
دژمن دڤێ خەون و خەیال بن
مەحمود دەروێش

* * *

فەرهەنگا ژینا من و تە
بن دەستیێ ژمەرا ڤەدکەت
ئەلبوما بیرهاتنێن مە
وارو کوخە رەشا ژمەرا ..
تەماشە دکەت
مێژوا باب و باپیرا
گورزێ خەباتێ یە برا ...
ل دەستێ مە دکەت
ئەز قوربان و ... تو قوربانی
ئەز بن دەست و ... تو بت دەستی
کورێ حەیڤاو .. ئەزێ لاوێ مهابادێ
مەحمود دەروێش

* * *

دەردێ من و تە
ئێك دەردە برا
بەندێن ئیرو ب بەندو زنجیرا
سێدارە نهان بو گەردەنا مە
خەلك دژیت ئازاو سەربەست
لێ ڤەلەك ژبەختێ مە دکوتن
رێگرە بو تەخت و سەرا
مافێن مە بونە خوش پارێ
بو تەماعکارو بەگلەرا
بلا .. بلا
ئە ڤە نە مافێن مروڤا
بلا .. ژارو برسییێت مە
بخون گیاو دارو بەرا
بلا .. خودان بەرگ و کاربن
سێوی لخو بکەن
بەلگ و پەرا
مافێن من و تە دبەرزەنە
رابە برا ..
دا لگەل بکەین جەنگ وشەرا
مەحمود دەروێش

* * *

خەلك سەربەستە
خەلەك تێهنێ خوینا مەیە
ژین بەحەشتە
لێ دوزەخا من و تەیە
خەلکێ شەرە لگەل مریدێن ...
ئەستێرو هەیڤ و مەریخا
لێ هێشتا زیندان و خەندەك
مالا مەیە
ئەم ژڤانێن روژەکا رون
سێدارە ژی ژڤانێ گەردەنا مەیە
ئەز بێوارم تو دەربەدەر
دەردێ من هەر دەردێ تەیە
ئەم خودانێن کوخە رەشاو ..
وێرانە وارو زوزانا
چەند گەرو چەرخ ژمەرا بورین
دەست برا دژمنێت مەیە
خەبات و قوربان و گوری
ئەو خەملا مێژوا مەیە
ئافا مە ئافا باپیرا
برا پاشڤە مایێ مەیە
مەحمود دەروێش

* * *

چەرخێ بیستێ ...
ها هندە دێ ژ مە بارکەت
دەردێ مە هەر دەردێ بن دەست
ژین قەت لە سلاڤ ناکەت
دژمن مە ئەتوم و ناپالم
بێ دەنگی بو مە دەست نادەت
ئەم بدن دەستێ ئێکاتی
باوەری راست رێکا مە بیت
مافێن من و تە د بەرزەنە
رابە دەروێش بلا بەس بیت

# بەخشانە

● نوری حەیران ●

بەخشە ئەی پەپولە زیزەکە ، ببەخشە تۆی هەموو عومرم خەماوی ڕامەبورە ، بەرگی ڕەشتان ئەمکوژێ ئەمرم منیش وەکتۆ چاوەکانم پڕخەمە ، دڵ خوێن ئەبارێنێ بەتەنیا تۆی پەنای روحم مەگەر هەرخوا بدا سەبرم فەرامۆشیم بەکەس نایەت ، لەدڵدا پڕ غەریبی تۆم وەرە بتگێرە سەر روحم «ئەزیز» گیان چۆڵەکە دەورم بەرەولای من گوزەرکە ، تۆ ئەی هەموو غەم ئەی هەموو عەشق و هەموو دنیام

هەتا شیعریش بەجێی هێشتووم ، وەرە ئەی جوانترین شیعرم دڵم نایەت بڵێم هێشتا منالی ، تۆ لەمانای عەشقی من ناگەی ئەبێ تۆکەی لەخەم ڕەخسێت ؟ منیش تاکەی سەبر بکرم ؟ کچێ تۆ ، .. کچێ خۆشم ئەوێت وەڵڵا لەخۆم زیاتر ئەتۆی ئەسبابی ویرانیم ، من وەکو مندال بۆشتی ترورگ دەکرم خوا .. ئەم عەشقە چیبوو ؟ ئەم ئاگرە بەربۆتە ریشەی دل خراپ شیواندی ئەحوالم ، بەئەم چەشنە شپرزەی کردوە فکرم ئەزانم من بەتۆ ناگەم ! ئەبیەمە ژێرخاک ئەم هەموو عەشقە «وەسیەت بێ کەمردم باوەکو باڵای ئەتۆبێ کێلەکەی قەبرم»[1]

(1) بێدەستی ئانقەست ئەم تاکە وەك تاکە شیعرێکی وەلی دیوانە هاتووە

# پێشوازیی

خۆزگە دارێك بام بەسەر زەنوێرو مێرگی پاراوا شۆڕ دەبوومەوە
پەلێکم بەسەر کوێستان نشینا دووردوور هەڵدەکشا
پەلێکیشم بۆ وەرزێرو سەپان لە گەرمەسێرا دەبوو بە کەپر
خۆزگە ڕەزێك بام لە داوێن کەژی پەنای بێ دالدان
پەنجەی پێی کچان لە کێڵگەی سینگما ،
مۆری یادێکی تۆخیان جێدەهێشت .
- لە بەر باو تەرزە ، لە هەراو زەنای ئەو ڕێگە دوورە بکەرێرەوە
لە ڕێ گوێ هەڵخە لاوکی ئاخی هەوارنشینان
دەردو مەینەتیی دەگێڕێتەوە ،
کە گوێت لە سەدای سترانی دۆڵو شاخ و لێر دەبێ
سەر لوتکەو چەمو درەخت و نزار
قژی خۆیان بۆ ئادەمیزادی ڕەتێندراوی
ئاقاری خۆیان بەچەپك دەڕنن !

* * *

کیژی هەواران لە چیغ دێنە دەر ، خۆزگە دەخوازن
کەپری قەدپالان لەخوارتر بوایە بۆ حەسانەوەی کوڕی ماندوی ڕێ
کچێکی شەنگی زێدی زامداری هەناوی مێژووی
وەك ئەرخەوان و وەك ڕەنگی بەفر
وەکو ڕێبواری شەوی کرێوە
سەودای تروسکەی ژێر هەوری ڕۆژگار
لەش بەحەسرەتی تینی ناخی خۆی
زار بەلاوکی دوێنێو ئەمڕۆکە ئەکەوتە هاوار
بەهەڵپە بەرەو مەنزلگە ئەچوو
مەمکۆڵەکانی لەژێر کراسی خۆڵەمێشینا
خۆیان لە سوخمەی ئاڵی هەڵئەسوو .
پێی نا بەجەرگیاو هەواڵی تاڵی کەیاندە لاوە :
- لە دوور ڕا دیتم ،
ئەوەی سەرنجی بۆ بەرزیی هەڵخا لەدوور دیارە
پێشکەڕانەوەی ، تۆ لە غەریبی ئۆردووی نەیاران ماڵیان بارکردین
وەکو ئاورێشم کەوتینە بەر بای ناوەختی شەوان
لە بەر پەیکانی ئەمدەست و ئەودەست
بووینە بێژنگی ئەودیو دەواری ماڵی ئاواران !

● مارف عمر گوڵ ●



حەسیب قەرەداخی

1983/11/27

بڵێی زستانی ئەم ساڵ بەفر بباری وەك پار ؟ .
بڕووخێنێ بەسەرما دیواری یادو یادگار !
خەبەر بەرن بۆ شێخم تەوبەکەیم کوشتووە
پەشیمانم پەشیمان هەرمەییکم رشتووە !
باری تەوبە گرانەو منیش شانم سواوە
هیچ شەرمو شۆی پێ ناوێ بڵێم وزەم نەماوە ،
گەڕیدە بووم لەعیشقا : عیشقی هەوێنی ئاوات
حیکمەت ئەڵێ بیبڕە دارێك بەرت پێ نەدات
لەسەر لوتکەی ئازارم بەدەنگ بانگو سەلاوە
گەنم گردو جۆ بڵاو ئەکەوێتو هەڵ ئەساوە
عەتری ئارەقی رێگەم لەدرشتو ورد ئەدا
گەردی پێڵاوی رێگەم لە رووبارو پرد ئەدا .
ئەی پێشڕەوی ئایینم ، ئەی مەبەستی ئەوینم
تاکەی لەخەرمانەتا عەکسێکی خۆم نەبینم ؟ ! .
لەناخەوە ئەسووتێم ، لەناخەوە ئەژەنرێم
کێ ئەزانێ ئەمن کێم ، کێ ئەزانێ کوڕی کێم ؟ ! .
تەوبەییکم کردە کوڵ تویشووی رێگەی سەفەربێ
سەفەر بکاتە خێری لەئەندازە بەدەربێ
ئەوەندە مێردەزمە خەوو خەمیان شێوانم
سەنگو مەنێك نەماوە بۆکێشو بۆ پێوانم
وام لەماڵی کاولابێ دەفرۆبێ دەرامەت
رەقیب ئەڵێ : ئەفەندی کوانێ بوونو بەرامەت ؟ .
ئەو رەقیبەی زمانی زۆر پیسترە لەو شیرە
سەری (حوسەین)ی بڕیو ئێستە لەناخم گیرە
لە پێستی خۆم هاتمەدەر ، ناوەڕۆكو ڕوخسارم ...
لەگونجانا نەماون ، خوایە کەقورسە بارم ! .
بارم باری عاشقە ، باریش بخەم مردنە
چەمکی ژیانی ئەمڕۆ هەرهێنانو بردنە !
کێشە لەخۆما شینە ، قەرسیلێکە بەراوە
تا ، رێی ئاوڕ خۆش ئەکەم لقو پۆپی خوراوە !
دژواری من دژێکە : بەخۆم ئاوسو پڕە
وەلیای ئەم کێشمە کێشە زۆڵێکە ئێجگار دڕە
خەبەر بەرن بۆ شێخم : تەوبەکەیم پێچاوە
لەدوو ڕێیانی عەشقا دەروێشەکەت تێماوە
ئاخ دوو ڕێیان لەدەستت ، چەندێ داخت گرانە
ئەگەر مەردیت خۆت وەرەو ئێستا رێگەت بزانە
گەنم تۆوی ناو درك ، جۆ لەعەمارا خڕە
سەریش زرکێکی تاڵەو دەمیش گیرفانی پڕە
ئەی مەینەتی عیشقی من ، لە کامە رێوەهاتی ؟
دیاردەیەکی سەیرو نامۆی بێشوێنو کاتی
خەبەر بەرن بۆشێخم : واتەوبەکەم ناردەوە
گیرو گرفتی ناخم دیسانەوە شاردەوە
خەڵکە سبەی زستانە . چین چین بەفر ئەباری
سەرپۆشەکەی ئەزمریش بەسەریا دێتە خواری
منی جگەر سووتاویش هەر چاوەڕێی «کەژاڵ»م
کەی دێتەوە لەهەولێر بەری ڕێی بۆ بماڵم ؟
لەبەر دەرکی ماڵەوە دوو تۆپەڵی تێکرم
جانتای ماندوو بوونی ڕێی بەخەندەیەك لێگرم
تف لەروخساری مردن تف لەناوەڕۆکی ئەو
«کەژاڵ»ەی لێوی ئاسۆ ئەخاتە ناوگەرووی شەو
شەوی بێئارامی من ، شەوی جگەر سووتانم
شەوێك بۆ هات لەبەرچی ؟ هەتا ئێستەش نەزانم ؟ !
خەبەربەرن بۆشێخم تەوبەم لەشەو هەڵکێشا
هەناوی شیعرو بەستەم سوور کردەوە لە ئێشا
رووی زەمانە رەش بووەو زەمانەوان شوێرە
هەر بڕواکەفتەکارەو هەر باوەڕیش فەقیرە
لێدەن بەچەپو راستا مەرجیش تێلای ئەستوورە
یاتەشتی پڕلەنانە ، یاچاوی سوێرو سوورە
ئەوەی دەردم ئەزانێ هەر ئەو لەشیعرم ئەگات
هیتر چەنە بازێکە بەراستو چەپما ئەدات
خەبەربەرن بۆشێخم هیچ لەدەردم ئەزانێ ؟ !
یائەمداتە بەر لمۆز وەك نۆبەندە نەبانێ
ژینو مەرگو فەلسەفەو شیعرو جگەر سووتانم
خەونو خۆراكو خەمو بەفرو شەوی زستانم
کێ بۆم ئەکات بەکۆکتێل ، کێ دێتە سەر خوانەکەم
کێ بۆم کۆنەکاتەوە بەرو بوومی ژانەکەم ؟ .
سەرژمێری رۆژی رەش عومرم نایگرێتەوە
باری لێوی حەسرەتم هیوایش نایسڕێتەوە
کە قاتماخەی ئەشکی سوێر چین چین بەسەریەکا کەوت
تاشەبەردی باری شان بوون بەپێنجو شەشو حەوت

کێ پێم ئەڵێ خۆت بگرە ، خۆراگرتن یانی چی ؟ !
رووبار هاتووەو شێتە ، واوەیلا بۆلقی بی
خەڵکە سڵم لێ مەکەن نامۆیەکی ئەم رۆژەم
میوانی بێ ئیختیار ، گەریدەی بێ پرۆژەم
رۆژ هەڵنایەت لەسەرم ، گەرداو ئەی لێسێتەوە
قومێ ناگاتە گەرووم ، ئاخێ ئەی هێنێتەوە
ئەی شێخەکەم کوا «کەژاڵ» وام لەدەرگای پیری‌یا
خۆزگە عومریشم ئەکەوت لەگەڵ دانی شیریا
باکەس بەدەردم نەبێو سەری تاڵم هەڵنەکات
ئەگەر رۆژی لێ‌هەڵهات بەرد بەدواما هەڵنەدات
شێخم ، واخۆم هاتمە لات رێگە زۆر چەواشەیە
رۆژێك «حەلاج»ی هاڕی ئێستەش هەر ئەوناشەیە
وا رازی ئەم تەوبەیەم ئەکەم بەبانگو سەلا
جەستە پێچاو پێچ ئەدەم بەگەردەلوولی بەلا
کە خۆمم کرد بەشارا سەرخانە کان تێك بچن
شەرمە ئیتر هەتاکەی رەش‌و سپی لێك بچن
خەڵکە با گوێتان لێبێ ، نەفامی‌یە یاژیرم ؟ .
خوێنەرێکی بێ ئینجیل دەروێشێکی بێ پیرم .
ئەو شەرابەی گرتمەوە لەهێشووی عومری تاڵم
خەست‌و خۆڵ‌و گەییوە ، رەنگی بە ئەشکی ئاڵم
وادا نیشتوم پێك بەپێك بیخۆمەوە بێ هەرا
شەویشی پێ‌بەرمە سەر بێ هەنسك‌و بێ چرا
ئای لەتەنیایی عاشق ، عاشقی رەنج بێوەریش
ئای لە دنیای سەردەمی بێ‌کێش‌و بێ پێوەریش
بووم بەدەریای دووری‌یەك ناخودایە نای بڕێ
بووم بەدەواری شەوێك چێشتەنگاوێ نای دڕێ
بووم بەپەلاسی خەمێك خەیاڵ ئەپێچێتەوە
بووم بەبێژنگی عومرێك ئازار ئەبێژێتەوە
رێبوارێکم کەوتوومە جەنگەڵی تاریکی خۆم
لەناو زەبەندی رێما نازانم بوکوێ ئەڕۆم !
دڵەراوکێو بێزاری ، دڵی شاعیر تاو ئەدەن
تۆوێکی دی ئەچێنن . دەست لێ شتن قاوئەدەن
باری ژیان تامەکەی وا لەپێ هەڵکەوتنا !
«سیزێف» خلۆر دەبووەوە لەچرکەی سەرکەوتنا ! .
ئەی شەرابە خەستەکەی هێشووی عومرە تاڵەکەم .
لە کووپەوە هەڵ بچۆ ، پڕ پڕی کە پیاڵە کەم ،
بۆخۆم‌و بۆخەرابات هەر مەیی تاڵ دەرمانە
با هەردووکمان هەڵی دەین چونکە قەستی سەرمانە .
«سیزێف» ناگاتە سەر شاخ ، تاشە بەردێکە باری
من چۆن بێمەوە سەر خۆم ، بەفرم بەسەردا باری ؟ ! .

* «کەژال» لەدلی مندا لەپێ‌و دانی «کمال»ی تصوفدایە .

## بۆ 1984

لێوی عاشق زەردەخەنەی لێ ئەبارێ‌و
لە ناخەوە بەکوڵ ئەگری
ئەی هەورەکە دەبیارێ
تابزانم فرمێسکی من بەخوڕترە یا بارانت ..
تا بزانم ناڵەی دڵم بەجۆشترە یا گریانت ..
دەبیارێ .. تەنیا بارانی بەخوڕە
چڵکی لەشی ئەم گەردوونە بێ دەستنوێژە ئەشواتەوە ..
دەبیارێ .. تا لاشەکان پاك نەبنەوە
هەرگیز زەوی پڕ بەگەرووی
ئاوی ڕەحمەت ناخواتەوە . !

* * *

ئەی ڕەشەبا کۆت‌و زنجیرت فڕێ‌دەو ... ،
شارەکەم بەجێ بهێڵە
چیتە لە خاکی پڕ ئازار
خانووی شڕی ئەم شارانە ..
دوورگەی خەمی هەزارانە . !

* * *

کێ ئەتوانێ قوورسایی ئەم دنیا شێتە
لەسەر شانی من هەلگرێ ..
هەتا چی‌تر نەهێڵم خەم لەناو دڵا چەکەرەبکاو
دەستی تاوان
کۆرپەی حەزی من سەربڕێ !

فەرمیوون عەبدول بەرزنجی
هەولێر ٤ی کانونی دووەمی 1984

# هوزانا توتنێ

مەلا عەبدولغەفورێ بەرواری

سوبحان ژ خالقێ دنێ
گوهـ ب دەن ڤێ گوتنێ
ها ئەڤ شیعرا توتنێ
ئەوا هویا دژوارە

دژوارە وەك ئاگری
دل و مێلاك کەزکري
وەکی کرمێ دار بڕی
هەر شین نەبو چو جارە

شین دکەی گاڤ و دەما
بیستان و زەڤی و چەما
شەڤ و رۆژا پێ ڤەما
پاشی ل تە بو نەیارە

نەیارە وێ تو کوشتی
تو هوسا بێ ڤەرستی
قەت بو خو نەکە پشتی
نە ڤە خو ژەهرەمارە

نە هێلا بۆ کەسێ دەنگە
دلێ وی یێ تەژی ژەنگە
نە وی خولکە نەوی رەنگە
سەبەب ئەو توتنا گارە

سەبەب ئەوە پر دژوارە
تو ژێ برەڤە نێ یا هارە
نەهێلا بو تە چ چارە
حەتا بوي مریێ لسەر شارە

هندی تو ساخی ئالوزی
دلێ تە پڕ غەم و توزی
یێ بێ وەعدی یێ بێ سوزی
چونکی توي بێ جگارە

نە تە خەوە نە خارنە
شەڤ و روژا ل تە دوژمنە
ژوێ نە بە تو ئێمنە
یاتە د گەزیت ئەو چ مارە

وێ تو هاڤێتی قورنەتی
ژ کەسب و خەباتی توکەتی
هندی ساخی بێ لەززەتی
تێبگەهە بو تە خوندارە

چ خوندارە ئەڤە بوتە
ژ بو مرنێ مەلکەموتە
خو هشیارکە ئەڤە بو تە
چ خوش وەعزە چ ئینزارە

چ خوش وەعزە یا من گوتی
توتن مشکە ل ناڤ قوتی
هەمی تشتێ ڤەرە ڤوتی
قەت پێ نەبر تە چ چارە

چارا وێ هێلانە ژ بني
وەکی خوینداری‌و دوژمنی
چ جارا ژی نەی ئێمنی
دێ تە دەتە بەر خەنجەرا

ئەو خەنجەرە هەمو گاڤا
ئەو ئاگرە ل ناڤ هناڤا
تو ئێخستی ژ دەڤ وچاڤا
غافیل نە بە ئەی کابرا

یەقین خوندارە ئەو بومە
هەرا دژوارە و مەشئومە
چ گازندە هەیە و لومە
ب دەستێ تە بو ئەڤ کارە

خو هوشیارکە ب ڤێ گوتنێ
قەت تو نە ڤەخو توتنێ

دێ تە بەتن ژ دەڤ ڤێ ژنێ
ئەوا هو ل دەڤ تە نادرە
دوخپتوری گوت تە زەرەرە
ئەهییا تە دکەت پێغەمبەرە
ب ڤێ حەدیسا موختەسەرە
نە زەرەرە و نەزیرارە

ئەگەر زەرەر نەبو بو تە
دێ هەوجەکەت عەیالێ تە
تە پاشڤە د بەت ئەڤ ئایەتە
(ولا تبذروا تبذیرا)

هەم حەرامە زەیاعولمال
ئەهیێ ژی دکەت نەبیێ دەلال
تۆ ژێ ب ترسە ئەی خوش هەڤال
تو ب جهـ بینە نەهی وئەمرا

سێ جارا حەرام بویە توتن
یەکەم زەرەر ئەوە دوژمن
دووەم تەبزیر ژێ ب ترسن
سێ یەم مالێ تە چو ژ چرا

خودێ مال دا بو لەززەتێ
سەرفەراز کەی پێ ئوممەتێ
دا تو پێ دچی جەننەتێ
نە دە ب توتن چ کافرە

ئەو کافرە تێ ناگەهی
ئەی سۆفیێ ب سەرو و رهی
تو وێ پێلە ژ بنێ گوهی
ئەمرێ خودێ نەکە دەرە

ئەمرێ خودێ و پێغەمبەرا
تو دەینە سەر چاڤ و سەرا
توتنێ نە کێشە ئەی برا
دا تو نەبی شەرمزارە

شەرمزاری ل ناڤ ئوممەتێ
خوسارەتییە ل ئاخرەتێ
قەت تو نایینی لەززەتێ
چونکی تە توتن ڤەخارە

ئەو کوننەهە ژ کونها مەزن
نە بێژە مەکروهە توتن
نە تو موشەرعی نە من
یێ گوهداربە ئەو یافەرە

دەمێ تەکەببورا شەیتان
سوجدە نەبر وی بۆ رەحمان
هاڤێت عەردا هەر بو توغیان
گوهـ نە دەنێ چ غەددارە

غەدوارە ئەو بو عالەمێ
دێ د گەل خو بەت بو جەهنەمێ
ژ بەر کێشانا شیرین خەمێ
د باطن دا کۆرەمارە

توتن حەرام کر عالما
ئەژی دبێژم وەکو هەما
سەد ئاهـ و دەرد و ئەلەما
بو وی کەسێ نە گوهدارە

توتنا نەجس تو ژی بڕەڤە
خەند خۆش بیت یا سەر دەڤە
بو غافیلی من گوت ئەڤە
تو نەفسا خو بکە ئیقهارە

ڤێ توتنێ چەوا دبینی
شەڤ و رۆژا تێدوەرینی
جیسم و جانی ل خو دەرینی
ئەڤە نە شەئنێ ئەخیارە

نەبێژن ئەڤ توتن سەبرە
سەبر هەر خویندن و زیکرە
کێشانا وێ ژ خونە جەبرە
خوزی وە هێلایا پارە

ئەزم مەلا گوهـ بدە من
ئەزم بووە فایدێ مەزن
دێ بەس هندە بدوێ بەزن
وە هلگرتی ئەڤ چ بارە ؟

چ شیعرەکا موتەووەل بو
تژی دوڕ و جەواهیر بو
ئەوێ چێکر موقەسسیر بو
ناڤێ وی عەبدو لغەفارە

# خەونی هەزارو یەك شەوە

طریب پشدەری/ قەلادزێ

1993/10/30

من فرمێسکی چاوی ئاسمانێکی تەم گرتووم
تۆ گوڵەستێرەی بەربەیانێکی ڕووناکی
من گەڵای زەردی هەڵوەریوی پاییزێکم
تۆ چرۆی نەمامێکی شلکە ساوای تاکی

* * *

من لەکەی ناوچەوانی عیشقێکی بێ نازم
تۆ داستانی سۆزی شیرینی فەرهادێکی
من دێری شیعری ، شاعیرێکی نەناسراوم
تۆ شاکارو ئەفسانەی . . (نەمر)ی یادێکی

* * *

تۆ سروودی گەرووی ، سروشتێکی نەزاوی
من دەنگی هاوارو نووزەی لێ قەوماوێکم
تۆ چەرخەچی کاروانێکی ، تازە ڕێ کردووی
من شەکەت و ماندووی هەوراز و جێماوێکم

* * *

تۆ پاکی کۆرپەی کۆش و باوەشی مریەمی
من (یەهودا)ی دەستی تاوانی ڕۆژگارانم
تۆ هەتوان و غەمخۆری . . . ئازاری دڵانی
من سفتوسۆی ، زامی سەختی بریندارانم

* * *

تۆ بزەو خەندەی لێوو قاقای پێکەنینی
من قوڵپی گریانێکی گەرمی بەکوڵی . . . ناوەختم
تۆ بووکی نازی ناو کەژاوەی «هیوای سوور»ی
من ڕێبواری ماندووی ڕێی هەوراێکی سەختم

* * *

تۆ ئاوازی پەنجەو بلوێری «قالەمەرە»ی
من ئاهەنگی قەتارێکی گەرووی «مامڵێ»ی نووساوم
تۆ شەنگەبێری شۆخ و سەر دەستەی بێریانی
من شوانکارەی بەڕێز نە بارانێ خووساوم

* * *

تۆ تروپکی بەرزی سەر کێوی قافی
من دامێنی نزمی ڕەوەزێکی ڕووتەنم
تۆ مێرگی سەوزی جێ هەوارێکی کوێستانی
من پووشی زەردی پاوان ، پەرێزێکی سووتەنم

* * *

من و تۆیەك ، سەدان هێندەی دی ، لەیەك دووربین
دەستی کورتی حەزم . . . دێنێتە دی ، ئەو خەوەت
تۆ شەهرەزادی شۆخ بەو منیش شەهریارت
گوێ ڕادەگرم بۆ چیرۆکی ، ئەو هەزارو یەك شەوەت .

* * *

پێشکەشە : بەو (نوقڵ)یەی ، مەلاشووی کۆرپەی ئەم شیعرەی هەڵدایەوە .

# «داخازەکا بێ وەغەر»

حکیم عبدالله محمد

دنیا ئێڤار بوو ، نێزیك بوودا رۆژ خو بەرزەکەت ژدالێت شەڤا رەش و تاری رەڤیت داکو رێکێ بدەتێ کراسێ خو یێ ب خەم نیهار بکەتە بەر عەردی هەمی دەنگو هاتن وچوونا بێ دەنگ بکەت و بمرینیت . یێ د ئودا خوڤە رینشتی بوو کتێبا وی یا ل سەر چوکێت وی بوو بو ئەزمونا رۆژا پاشتر دخاند . یێ مژویل بوو دگەل کتێبێ هزرو بیرێت وی و یێت کتێبێ دگەلێك تێکەل ببوون ، دەمەکی جلفەك ڤێ کەڤت دگەل دەنگێ گازی یەکێ هاتێ زانی ئەڤە دەنگێ بابێ وی یە یێ گازی دکەتێ . راست رابو ڤەستا ئودا دی کر ئەوا بابێ وی لێ (چ جارا بابێ من هندێ کەیف خوش نینە وەکی . ئەڤرو ... چ چێبیە ... ؟) رینشتە خارێ برەخ بابێ خوڤە .

- بابۆ تو مەزن بوی ئو وەختێ تە و ژنانە ڤێجا مە گوت ئەم دێ ئەڤ شەڤە چین کچا مامێ تە بو تە خازین . دڤیا باخڤیت بەرسڤا بابێ خو بدەت کولا دلێ خو دەرکەت کو یا وی دڤێت نە کچا مامێ وی یە . بەلێ ئێکا دی یە یا ئەڤە چەند سالە کەڤتیە دەریا ئەڤینا وی ، تژی دەڤێ خو ئاخڤتن کر بەلێ هەروەکی چەندەکا پێکڤە دەڤێ وی گرتی و حەڤکا وی شداندی ، لەرزکێ لەشێ وی گرت نەدشیا لێڤێت خو ل سەر ئێك راکەت دڤیا بێژیتە بابێ خو من نەڤێت بەلێ نەدشیا ل بەر دەڤێ وی بدەت ... رابو بێنەکێ دەرکەڤتە ژدەرڤە ل ناڤ حەوشێ هات و چوو چەند هزرەکا دەرکەهێ مەژیێ وی ڤوتاو چوونە ژوور ...

- ئەز دێ چەوا کچا مامێ خو خازم ؟ دێ چ بێژمە مەڤالا خو ... ئەڤیندارا هو ... ؟ یا کو مە سوزو پەیمان داینە ئێك یان ئەم بو ئێك بین یان بو ئاخێ بین ، خویشکا من وێ رۆژێ دگوت کچ ماما تە بەحسێ تە دکر ، بلا هەر بەحسێ من بکەت من نەڤێت ... نەڤێت ... بەری چەند رۆژا ب رێکا خاندنگەهێ ڤە بسەر ئاخڤتنێدا چوو بوون .

- تو دزانی (ڤیان) هەکە ئەز رۆژەکێ تە نەبینم بێنا من ل چ عەردا ناهێت . من دڤێت هەر ل دەڤ تە رینم تێر بەرێ خو بدەمە دیمێ تە .. تو ژیانا منی ... تو هیڤییێت منی ...

- خوزیکێت وێ رۆژێ هەکو ئەم دگەهینە ئێك ، هیڤیێت من و تە بجهتین . دا ژنوی بەرپەرەکێ نوی ڤەکەین بو ژیانا خو ..

- دا خاندنا خو بدویماهی بنیین . ئێکسەر دێ بابێ خو ڤرێکەم دەستێ تە بو من ژبابێ تە بخازیت . ئەز هەر تە ناهێلم

- دێ کا وەرە ژوور کورێ من ئەڤە تە چی یە ... ؟

ڤەستا ژوور کر دەرکەهـ ڤەکر د نیڤەکا دەرکەهی دا راوەستا . بەری بابێ وی باخڤیت چەند پەیڤەك دانە بەرێك .

- با ... با ... ب ژ من ڤەبن ئەز چ ژنا نائینم بەلا خو ژ من ڤەکەن دا ماندنا خو خلاس کەم پاش کەسێ دەستێ هەوە نەگرتی یە .

دەرکەهـ گرت و زڤری (دا ئەز بێنەکێ دەرکەڤم ژ ڤی خانوی هەکە ئەز دێ خندڤم .. دێ مرم)

ژ دەرێ خانوی دەرکەڤت دوو جارا ل کولانی هەلنگڤت وەکی مروڤەکێ دین و هار لێ هات ژ ڤی لای دچوو ڤی لای . چاڤێت وی وەکی دوو پەلێت سوورێت ئاگری لێ هاتبوون . هەرچیێ دبەرڕا چوویا دا چاڤێت خو پەرخینیت دا باش دیتبا ... چەند کەسەك ل رەخێ جادێ دراوەستای بوون دبەر وان ڕا چوو هەمیا پێکڤە بەرێ خو داییێ .

- برا خو ڤەدەن ئەڤ مروڤە یێ سەرخوشە .. !

دێ بلا برا تو ژی یێ هەڤی بەس ئەز نەیێ سەرخوشم ڤەستا جادێ کر داکو دەربازبیت بێ ی کول دور خو بزڤریت کا چ دهێت چ دچیت .. هەما بدەست ب دەرباز بوونێ کر .

- یا خودێ ... ئەڤ ... بوو ڤێ سیرێنێ گوهێت مە کەرکرن .. !

- بخودێ ترومبێلێ ل وی مروڤێ هەنێ دا ... کا دا سەحکەین چەند مروڤەك لێ کوم بوون راکرە سەر دەستێت خو پەیڤەك بتنێ ژ دەڤی دەرکەڤت (ڤیان)

- ئاخ بو ئەڤیندارا ... ! هەمی دێ ب وێ کولێ چن

- خودێ ژێ رازی بیت ئەم هەمی دێ مرین .

صدر الدين خۆشناو
جەڕا ـ برادۆست
1979

# «کـاروانچیەکـان بـۆ نەگەڕانەوە»*

– 1 –

بەفر دەبارێت ، وەستانی بۆنیبە ، دیمەنی گوندەکەو تەنانەت هەموو ناوچەکەشی داپۆشیوە ، کێوو کەندەلانەکان پڕ بوونەتەوە .. هەموو شوێنێك سپی دەچێتەوە .. تەم و مژەو چاو چاوی نابینێت .. سڕی سەرما تەنگی بەدانیشتوان کردووە .. دووکەلی سۆبەکان لەسەر بانەکان دیارەو .. بەرزدەبێتەوە .. ئاژەلەکانیش هەموو لەسەرمان خۆیان وێك هێنایە .. برسیەتی تەنگی بەچۆلەکەکان و گشت باڵندەکان ناوە .. جریوەی چۆلەکەکان دەنگ دەداتەوە .. پەلاماری ژوورەکان دەدەن .. بۆ تۆزێك دان .. لوورە لووری ڕەوەگورگەکان بەرز بوویەتەوە . وورچ و بەرازیش لەدێیەکە نزیك بوونەتەوە .. ڕەوینی سەگەکانیش لەهەمان کاتدا دەست پێدەکاو .. وەلام دانەوەی گورگەکانە .. دڕندەکانی کێوی بەرەو ئاوەدانی دێن .. ترسیان لێ شکاوە .. لەم کاتەدا دەمەو بەیان بوو .. هەموو منداڵ و ئافرەتەکان لەبەردەرگاکانیان وەستابوون .. بەکزو هێمنانە .. برسیەتی لەچاوەکانیان دیاربوو .. هەموویان چاوەڕوانی گەڕانەوەی کاروانەکانیان دەکرد .. دەیەها پرسیار لەمێشکیان خولی دەخواردوو بەلام بەپرسیارێك دەریان دەبڕی .. بۆ نەگەڕانەوە ؟.. بۆ ؟ . (نەوزاد) یش لەپەنجەرەی ژوورەکەی تەماشای دەرەوەی دەکردو .. ئەمیش هەرچاوەڕوان بوو .. لەبەرخۆیەوە دەی ووت :ـ گەر بگەڕێنەوە .. هەمووشتێك کۆتایی دێت .. لەملاشەوە ناڵە ناڵی پیرە دایکی ژوورەکەی پڕکردبوو .. نەی دەتوانی بستێك لێی دوور بکەوێتەوە .. لەم ساتەدا یەکێك بەرەو رووی ماڵەوەیان دەهات .. زوو بەپیلیەوە چوو ..

– (شەمام) تۆی ؟

– بەلێ .

– خەبەرێکت پێیە .

– بەدەنگێکی نزم ووتی نەخێر .. بەرەو پیلی کاروانچیەکان دەچم .

– (نەوزاد) یش ڕەنگی بزرکاو .. منیش دێم .

– ئەی ئاوەدانیەکە بەتەمای کێ بێت .. ئەی پیرە دایکت .

– کەی دەگەڕییەوە ؟

– لەگەل کاروانەکان .

دایکی (شەمام) یش وورده وورده هاتەپێشەوە .. بەخۆی و گۆچانەکەی .. هەندێ منداڵی دیش بەدوایانا بوون .. هەروەك جەرگ سووتاوێك وابوو .. چڕی سەرما دەست و پێیەکانی تەزاندبوو .. هەموو ناخۆشی کچەکەی لەچاوەکانیدا دیاربوو .. زیاتر هاتە پێشەوە ، هاتە لای هەیوانەکە ، نزیك بووە وەلەدەرگای ژوور .. تەماشای بەژن و باڵای کچە خۆشەویستەکەی دەکرد .. دەلێی جاری یەکەمە دەیبینێت .

(شەمام) یش فرمێسکە قەتیس ماوەکانی و دەنگی گریان لەقوڕگیدا ڕاوەستابوو .. لەگەل نەرمە کۆکەکەی دووبارە دەبووەوە .. منداڵەکانی گوندیش لەلایەکەی دی شان بەشانی دایکی (شەمام) دەرگایان گرتبوو .. سێبەرێکی گەورەیان پەیداکرد .. (شەمام) یش چاوە گەشەکانی ماڵق بوون ، یەکە یەکە تەماشای هەمووانی کرد .. وورده وورده هەنگاوی هاویشت و .. لێیان دوورکەوتەوە .. بۆلای پەنجەرەکە رۆیی .. دایکی و منداڵە بچکۆلەکانیش بەدوای دەڕۆیشتن .. پێیەکانیان لەدوا نەدەهات ، هەروەکوو گایەك کەوا پێیەکانی پاشەوەی لەناو (دەقنەیەك[1]) جێ مابێت .. گەیشتە ئاستی پەنجەرەکە .. سەری خۆی بۆ پەنجەرەکە شۆڕ کردەوەو تەماشایەکی ژوورەکەی کرد ... خۆی پێ ڕانەگیراو .. فرمێسکی چاوەکانی گوڕگوڕ بەنایلۆنی پەنجەرەکەدا دەهاتە خوارەوە هەروەك ئاوی باران وابوو .. (نەوزاد) یش نزیك بووەوە لەپەنجەرەکە .. هەناسەیەکی ساردی کێشا .. هەلی دەوی بەنایلۆنی پەنجەرەکە کەوت و لەگەل فرمێسکەکان تێکەل بوون .. لەم ساتەدا .. دەنگێك هات ..

– خۆشبە .. وائەسپ ئامادەیە .

لە ئاستی پەنجەرەکە لاکەوت و .. دوورکەوتەوە .. کوڕەش تاچاوی توانای هەبوو تەماشای کرد .. لەگەل هەنگاوەکانی دەڕۆیشت .. حەزی دەکرد دیواری ژوورەکە هەموو پەنجەرە

بانه .. بۆ ڕووناكی چاو .. بۆدیتن .. بۆ بەڕێ كردن .. بەساردی لەشوێن خۆی بەجێماو .. چاوەڕوانی گەڕانەوەتم .. چاوەڕوانم ..

- 2 -

بێ دەنگی ژوورەكەی داگرتو .. بەفر وورد وورد و خێرا دەباری ..

- ئەمە زۆری لەپاڵەو .. زیاتر دەكەوێت .. چەند كەوتیە ئەوەندەی دی زیاد دەكات .

ناڵەی دایكیو دووری شەمام كارێكی زۆری تێكرد .. برسیەتی یەكەی .. بۆ خۆی دەدواو ..

- ئەمە ئێوارە داهاتو .. ژوورەكەم تاریك بووە .. ڤانۆسەكەم ژوور ڕووناك دەكات .. بەڵام ئەوە دەروونم تاریك بووە .. كێ دەروونم ڕووناك دەكاتەوە ؟ .. بێگومان شەمام خۆتی .. ڤانۆسی دەروونم بووی - شەووڕۆژی دەژماردو دەی ووت :- بۆ نەگەڕانەوە ! .. بەڵام چاوەڕوانی چسوودێكی هەیەو پێویستە خۆم بەدوایانا بچم . ئیدی خۆی پێ ڕانەگیراو .. بەرەو ڕێچكەی خوشەویستەكەی كەوتەڕێ .. شوێن ڕێگاكە دیار بوو .. بەفری نیشتو شەق كرابوو .. بەفر وەكوو (كەچەلێف[2]) دەهاتە خوارەوە .. تۆزێك هێواشتر لەپێشتر ڕۆیشت .. ماندی بوو .. نەوەستا .. دەگەڕا بەشوێنی .. شتێكی سەرسام خۆی پیشاندا .. چاوەكانی ڕەشكەو پێشكەی كرد .. لەئەسپەكە هاتە خوارەوە .. تەماشای كرد .. بۆی دەركەوت ئەمە شوێنی لاشەی خۆشەویستە كەیەتی .. دڕندەكان خواردوویانە .. تەماشای ڕێچكەی خوێنەكەی كردوو ووتی :- ئەمە خوێنە سوورە گەشەكەیەتی . لەگەڵ بەفری سپی تێكەڵ بووە .. بەفری تواوەو خوێنی سووری گەش تێكەڵ بەیەك بووینە .. جیا كردنەوەیان مەحاڵە .. شۆڕدەبنە وە بۆ ناخی زەوی ، ڕەگی داربەڕووەكان هەڵیانی مژت .. بەهێواشی هەستاو ئاوڕی لاكەی دی داوەو .. ترسی لێنیشتوو .. دەیووت :-

- ئەی دڕندەكان ئێوە لەپێناوی چی خۆشەویستی منتان كوشت . ئەم ووشانەی لەدەم دەرچوو .. چاویشی لەداربەڕووەكان بوو .. خۆشەویستی یەكی غەمگینانەیان دەنواند .. كلۆكلۆ بەفر لەسەر لقەكانی دار بەڕووەكان دەهاتە خوارەوە .. وەكوو بڵێی ئاگایان لەهەموو كارە ساتێك بێت كەلەم شوێنە ڕووی دابێت .. جۆگەلەكانیش بەشێك لەخوێنە سوورە گەشەكە كەتێكەڵیان بوو .. شۆڕ بووەوە بۆ ڕووبارەكان و لەوێوەش بۆدەریاچەو ئۆقیانووسەكان .. دووسێ هەنگاو هاتە شوێن كارەساتەكە .. زۆر بەپەرۆش و وەبەهەستێكی عاشقانە ئێسكی قەفەزەی سینگی هەڵگرت و لەباوەشی خۆی نا .. زیاتر گەڕاو كاسەی سەریشی لەژێر بەفرا دۆزیەوە .. بەتێروانینێكی سەر سوڕمان سەیری كاسەی سەری دەكردو .. بێدەنگی دایگرت .. لەبەر خۆیەوە دەدواو .. لەگەڵ هەستی مێشكی (شەمام) قسەی دەكرد .. زیاتر گەڕاو بڕبڕەی پشتیو لەگەڵ پەراسوی پشتەوەشی دۆزیەوە .. هەمووی چوار پارچەن .. بەشەكانی تری پێ نەدۆزراوە ..

- ئەی دڕندەكان دەتانەوێ تێربن ؟ .. بەخوێنی ئەم مرۆڤەو هەزارانی وەك ئەمیش تێرنابن .. ئێوە چاو چنۆكن و .. چرنووكتان تیژ بەهایە . ئێسقانەكانی كۆكردەوەو لەگەڵیانا دەدوا .. كوا خوێنەكەتان .. كە پێكەوە لكابوون و لەچركەی بوونتان پێكەوەبوون .. بەڵام ئێستا لێكدابڕانتان دەبینم .. دەبێت بۆمردنیش پێكەوەبان .. پێكەوەبان .. دەنگی هەڵبڕیو سوور هەڵگەڕا .. هێمن بووەوە .. گۆڕێكی هەڵكەند .. ئێسقانەكانی ناشت .. لەسەر گۆڕەكەی نووسی ئالێرەدا مرۆڤێك خوێنی ڕژا لەپێناوی گوندەكەی .. بەرەو پێلی كاروانچیەكان چوو .. نیوەی ڕێگای بڕی .. خۆی ئامادە كردو .. ماڵ ئاوایی لەگۆڕەكە كرد .. بەتەنیایی جێی هێشت و .. پێی ووت :

- پێویستە ڕێگاكەت تەواوبكەم .

ڕۆییو .. بەرەو هەورازەكە سەركەوت و .. هەر تەماشای گۆڕەكەشی دەكرد .. ڕۆییو .. دووركەوتەوە .. دووركەوتەوەو تاكوو گۆڕەكەی لەبەرچاوان وون بوو .

*** ئەم چیرۆكە لەكۆڕێكی كۆمەڵو هونەرووێژەی كوردی لەگەڵ سێ چیرۆك نووسی دی دا لەڕۆژی 1979/8/20 لەبارەگای یەكیەتی نووسەرانی كورد - لقی هەولێر - خوێندرایەوە . وەمامۆستای چیرۆك نووس كاكەمەم فەخری بۆتانی : هەڵی سەنگاندن .**

**1 - دەقنەیەك : ئەمەش ئەوقوڕو لیتاوەیە كەوا ڕەشە وولاخ یاخود دەوار ناتوانی بەئاسانی لەناویا هەنكاوبنێت .**

**2 - كەچەلێف : ئەم جۆرە بەفربارینەیە كەشێوەی بەفرەكە درشتەو ، وەچەند بكەویت كەم ئەكەویت .**

● كريم جميل بيانى ●

# ل ڕوٚژەکا بەفرین

هەروەکی دوهی ، بیریٚت بچویکاتییٚ چ جارا ژ بیرا مروڤی ناچن ، دبنە نوٚژو پیٚڤە دنویسیین ، ئەڤ بیرە لگەل مروڤی شیندبنو مەزندبن .. ئەریٚ ما مروٚڤ چیە ؟ . هندە بیرو هزرن .. هندە داخوازو ئومیٚدن ، هندە باوەرینە ، مروڤی دبەنو دئینن ، ڕادکەنو دادنن .. مروڤی دکەنینن ، دگرینن ، ساخ دکەنو دمرینن ...

ئەز ژ خەویٚ هشیاربوم ، بەلیٚ من خو دناڤ نڤینادا متکرو گوهیٚ خودا گوبگوبا سوٚپیٚو دەنگیٚ ڤەقوتانا شوینکا دچو بەر ئاسمانا ، من هیٚدیکا لیٚڤا لحیٚفکیٚ ژ سەر چاڤیٚت خو ڤەدا ، هندە ڕوناهی ل ژور بەلاڤ ببو ، ئەز شیام ساپیتکا لبەر ببینمو کاریتا بهەژمیٚرم ، من زانی کو هیٚشتا سپیٚدەکا زوییە ، سوٚپا دارا یا شاراندی بوو دایکا من خو لبەر کربو ڤورمکو دەستیٚت خو ددانی .

- دیٚ هلوڕابە داوێ بەفرا هاتیو دەروکولانیٚت هاتینە گرتن .

گاڤا دایکا من وەگوتی ، ئەز وەسا ب کەیفوب لەز ژ بن نڤینا دەرکەفتمو من خو ل دەری داو خو هاڤیٚتە بەرسڤکیٚ .. هەی هەوار .. ئەز مامە مەندەهوش ، بو دیتنا چاڤیٚت من دیتی ، بەفر پتر ژ چوکەکی کەتبو ، دونیا یا گرتیبو ، مژو موران بو .. بەلیٚ بەفریٚ ڤەکربو ، ب شەڤیٚ بەری ئەم بنڤین بەفرەکا هویر دهات ، بەلیٚ من قەت باوەر نەدکر دیٚ وەسا کەڤیت هەتا بەری ئەز د خەوژیٚ بچم هەر من دگوت خوزی هەتا سپیٚدیٚ ڤەنەکەت ، ئەز لسەر وان خوزییو هزرا نڤستم ، خودیٚ لدویڤ دلیٚ من چیٚکر ، ئەریٚ ما تشتەك ژ بەفریٚ جوانتر هەیە وەکی دبیتە تەخە لسەر دارو بەریٚت ئەڤی وارییو سپیدکەت ؟ کوٚلکی مریشکیٚت مە چ نەمابو دا د بن بەفریٚڤە بەرزەبت ، دایکا من ب شەڤیٚ هەمی مریشك ڕەڤاندبونو کربونە د گوڤیٚڤە ، ئەو هافرو داردینکیٚت ل حەوشیٚ چ شوٚپ بو نەمابون ، هندی من چاڤیٚت خو ل وان سیڤاندا گیٚڕان چ گلیلە پیٚڤە شوورِ نەببون ، نیٚ هیٚشتا ئەوریو مژیٚ دونیا نەبەردابو ، چیرەچیرا باگوردانا دهات ، جیرانا بانیٚت خو دمالینو دگیٚڕان ، لسەر بانیٚ بەرامبەر خانییٚ مە ژنکەکیٚ بانیٚ خو مالیبوو هندەك کا کربو د بنیٚ گوینیکەکیداو شوینکەك د دەستیدا بوو هەیدەهەیدا ویبو کا ب سیڤاندا وەردکرو ڤەدقوتان ، ئەو دیهیٚت چل ل دورو ڕەخیٚت خانی بەفر لسەر ببو خیڤەت ڕپ ڕپا پیٚت بابیٚ من دهات لسەر بانیٚ بەرسڤکیٚ بەفر دمالیو خیشیٚنا بەفرییٚ وی بو ، بەرسڤکا مە یا فرەهـ بو ، دوو دەر دهاتنیٚ ، ئێك ژ ژورا مە یا نڤستنیٚ و ییٚ دی ژی ژ ژورا ڤیتی .. د دەریٚ بەرسڤکیٚدا دوو دوشك هەبون ئەم لسەر دڕوینشتینە خارو زڤستانا بابیٚ من شفکیٚت ڕیلا دئینانو لسەر ڤان هەردوو دوشکا دکرە پەژانك هەتا بەر ساپیتکا ، بەس ڕیٚکا هاتنو چونیٚ دهیٚلا .. بەرسفکەکا بیٚ سەروبەر بو وەکی سەریٚ هارو دینا ، د سینکیٚ بەرسفکیٚدا دایکا من کوچکەك چیٚکربوو چەند خانی دهنی ئەوژی ل گەل دهنی ، سیٚل ل سەر بوو ب ڕەخ ڤە خانکیٚ نانی ییٚ پالدای دیواری بو ، ل ویٚڤەتر هندەك گوینیکیٚت تومکو کاییٚ ل سەر ئێك بون ، ل بەر دوشکەکی دوو جەڕکیٚت ئاڤیٚ ددانایبونو لبەر دوشکیٚ دی کورتانو جلیٚت کەری ، دووسیٚ ملیٚت داریٚت ڤەدکری ل کوژیەکیٚ بەرسفکیٚ بون ، ل نیڤا بەرسفکیٚ جوهنییەك ییٚ د ئەردی ڤوتای بو .. دەستە جوهنی لگەل بەریٚت دستاڕی لبەر دیواری بون ، هندە ڤلزانكو مەنجەلوك لوارا دبژالەبون ، ئەو سنگیٚت د دیوارارا هندەك توورك پیٚڤە دهەلاویستیبون ، نزا چ تیٚدا بو ..

بو چەقچەڤا ددانیٚت من ژ سەرمادا ، ئەز جارەکا دی ب لەز ڕەڤیمە د ژورڤەو چوم لدەڤ دایکا خو لبەر سوٚپیٚ ڕوینشتمە خاریٚ .

- هشیاربە کوڕیٚ من دەرنەکەڤیە ژدەرڤە ، دیٚ مری ژ سەرمادا ، دیٚ ڤەرمیوکەڤیە د دستیٚت مەدا پاشی دیٚ تە کویڤە بەین ، دیٚ بو تە دوختورەکی ژ کویڤە ئینین ، باشە داوێ ، بەجتیٚ تەدا مە دەرنەکەڤی من خو بیٚدەنگ کر ، لیٚڤا سەری ل یا بنی نەدا ، بەلیٚ من د دلیٚ خودا دگوت : (تو ڕاوستیٚ بە ، بلا گاڤەکا دی هەڤال کومببن ، پاشی بلا ئەز خو د کونا خانوی‌ڤە بکرم .) بابیٚ من ژ بانی هاتەخاریٚ پشتی پاش مالیو گیٚڕای ، هاتە ژور ، دەرسوٚکا خو د بن گوهیٚت خو ئالاندبو ، ساکویەکیٚ

کەڤن و پەرتی دبەردا بو ، هات و خو د سوپیێ وەرکر :ـ

- ئەڤە جارا دوویێیە ژ شڤێدی وەرە ئەز بانی دماڵم .. ئەز هیلاکبوم .. وەرە ڤێجا هەرو بسەرکەڤە بانی ، بماڵەو بگێرە .. کاکەو ڤەقوتە ، تەژی خوشیا خو یادیتی .. تو ڕوژەکێ وەکی ژنێت خەلکی نابێژی هەما دا بچم هاریبکەم ، ژنا (حەسو) ی پان دگێرا ، (بەسنا) هەتا نوکەژی یا لسەر بانی بەفرێ دمالیت ، توژی خو لبەر سوپیێ پەحنکە ، مایا بوتە دڤەتیت ، بوکێ دڤەتیت ؟ .

- ڤێجا ما ئەز چ بکەم و چ نەکەم ، ئان دێ ب زك و کارێ هەوە ڤە بم ، ئام ژی دێ بو تە بانی ماڵم و گێرم .. ئەڤا هەنێ ژ ملێت من نائێت ، ما ئەز چ مە ؟ .

دایکا من وە گوت و ڕابو دا بو مە سەرتێشتێ بینت نوکە هوین دبێژن کا سەرتێشت چ بو ؟ .. دەم زڤستان بو ، خەلکێ بەلنگاز و نە هەیی بو ، دەست تەنگی بو ، گەنموك و جەهـ دکرنە نان .. گارس دهێران و دگەل گەنموکی تێکەلدکرن و دخارن ، خەلکی ژێ نە دهات هەمی دەما نانێ گەنمی بخون ، ئەوێ ژێ هاتبایە ژی ، هەمی کاڤا دل نەددا ، ئەو سەر تێشتا دایکا من وێ سپێدەیا ساڕو بەفرین دانایە بەر مە ، دانهێرك و نیسکا شەڤی بون و هەچیێ سەرتێشتەکا وەسا خواربا هەروەکی تشتەکێ گەلەك ببەرکەتی و ب تام خواری ، ژبەر نە ل هەمی مالا ئەڤ سەرتێشتە هەبو .. ڤێجا ئەڤ دانهێرك و نیسکە دا بنە بەستی لبەر سڕو سەڤەمێ و دا ئینن سپێدێ نیسکێ گەرمکەن هەتا دکەلی ڤەو دانهێرك دهێلا وەسا نە گەرم دکر ـ دایکا من دگوت دێ ببنیڤە سوژت و بوسی بت ـ ڤێجا دا کەچکەکێ وێ نیسکا کەل ل گومتلێت دانهێرکا تەزی کەتی و کەیە د دەڤێ خودا ، ئەو نیسکا کەل دا ئەزمانێ تە سوژیت ، بەلێ وەکی تە ددانێت خو د گومتلێ دانهێرکێ دا بربانە خارێ دا پێویت تە ڤەرسن ژبەر نیڤەکا گومتلی یا تژی بەستی بو ، د سەر هندێژێرا مروڤ دکەتە سەرو تێر دخوار ، پشتی مە سەرتێشت خواری ، دایکا من جارەکا دی بو من گوت و ڤەگێرا و گەف لمن کرن دا ژ خانی دەرنەکەڤم ، بابێ من ژی پێت خو ژبەر خو ڕبون و کەتبو سەر ئەنیشکا خو لبەر سوپیێ ، جگارە ب جگارێ ڤە دنا ، ژور دیدابو ب دویکێلا جگارێت خو ، ئەو ب خو یا دیدات بو ژبەر دویکێلا سوپیێ ، بیستەك پێڤە چو ، بو ڤێری و گازیا زەلام و جحێلێت گوندی ، گازی ئێك و دو دکرن دا کارێ خو بکەن بو (کارە کەوێ) ، گرەك بەربو من و بنێ پێت من خوریان بو چونا کارە کەوێ و من خول ئەردێ خودێ نەگرت ، ئەو ژمێژە من مرادبو ئەز ببینم کا چەوا کەوا دگرن ئەز مام و من هزرێت خو کرن کا دێ چەوا چم دایکا من ئەو ژ سپێدا خودێ وەرە بو گەف لمن دگرن ، و من پێلاڤ ژی نەبو پێ بچم .. بەری هینگێ ب هەیامەکێ دایکا من بو من کالکەکا چەرمی چێکربو ، نزا چەرمێ چێلێ بو .. بێ گولکا بو ؟ بەلێ کی دزانیت د کیڕێ ڕا یە ، من ژ کویڤە دکرە پێ خو ، نە هەرێ حەویا من نەهات ئەز چوم لبەر سفکێ لێ گەڕیام د بن وان قاچ و کلوسکا ڤەو د ناڤ وان گلدو گینیکارا هەتا من دیتی هەرکتەك د کونجەکێرا بو .. وەکی بەری لێهاتبون ، چەرمەو لبەر بەفرێ هەوە دڤێت چلێ بێت ؟ . من برنە ژورو دانە سوپیێ دا پیچەك ژێك بێنەدەر و بشێم بکەمە پێ خو ، دایکا من ما بەرێ خو دا من :ـ

- ئەڤە دێ چ کەی ؟ ئو تە ئەو کالك ژ کویڤە ئینا دەرێ

- دێ دگەل زەلاما چمە کارە کەوێ .

- هەی ما شەڵلا ، ئەوا مای تە نەکری ، هەما تو پێ ژ گوڤەندێ کێمی ، دێ هلو زوییە وێ کالکێ پاڤێژە وی جهێ تە ژێ ئینای و وەرە ڕوینە ، خولەوچە نەکە ، کوڕك دێ چیتە کارە کەوێ ... دێ ڤڕی ، کوڕو ما تو دینبوی .. تو هاربوی ؟ !

- تە چ ژمنە ؟ دێ چم ، هەمی بچویك دێ چن ..

- کوڕێ من دێ کەڤیە دمستێت مە ڤێ زڤستانێ لبەر خو ڕاوستە ، تە چ ژ هەمی بچویکایە ؟

- ب خودێ دێ چم .. ئەها ..

- پا ب خودێ تو ناچی .. ئەها ... پا دیارە دێ بتە بیت .

- دێ ژێڤەبە عەبدا خودێ بلا بچیت ڤەمی دمریت .. تە چیە هندە سەرێ خو پێڤە گێژدکەی .. هلو هەرە کوڕێ من هلو ..

- هەما ئەڤە کارێ من و تەیە ، گەر من تشتەك گوت تو دێ لبەر دەڤێ من دەی ، نێ هەمی تە وە لێ کر ، هەتا ڤێجا گوهێ خو نادەتە کەسێ هەمی تە ڤێلخراب کر .

پشتی دایکا من زانی دێ ڕکمانیێ کەم و بابێ من دێ پشتا من گریت و دێ هەر ب سەرێ خودا بەمە خارێ ، ئینا ب ڕەقی و لێخوڕینڤە گوت :

- ئەز چ لتە بکەم ؟ .. ڕوپیێ تە ژوێ کالکا چەرمی قایمترە ، ما هەکە ئێك شەرم نەکەت و دل ب خوڤە نەبیت و گوهێ خو

نەدەتە کەسێ ، دێ مروڤ چ بێژیتێ ؟

ڕابو ل وان ڤولاچا گەڕیا ، پشتگورکەك ئینا و هاڤێتە بەر من و گوت :

- بکە پێ خو هەما چنە دێ پشتا پێتە گریت هلو هەڕە هندە کاپێ ژی ب کە بنێ کالکا خو ، نێ چەرمە ما دێ چ پێتە پاریزیت ژ سەرمایێ .. هلو .. شڕو ..

ئەز ڕابوم و چوم و من تژی بنێ کالکێ کا کر و ئەو پشتگورك کرە پێ خوو کالك دا سەرو دەلنکێت دەرپێ خو یێ خەزنەی باش گزێدان ب شروخێت کالکێ .. من دەست هاڤێت کوپالکێ خو

- هەر من لگەل خو هەلدگرت وەکی ئەز دەردکەڤتم ، هێشتا یێ بەرکارکا بو - من قەستا ژ دەرڤە کرو ئەز کەڤتمە ناڤ بەفرێ ب دویڤ جحێلێت گوندی ڤەو من شەقاندو قەستا ڕەخێت گوندی کر .. بەفر چ نەمابو دا دمتە د ناڤ تەنگا من ڕا ئەو چیاو دول و نهال هەمی دسپی بون ، مروڤی چ پنیێت ڕەش ل چ ئەردا نەددێن ، بایەکێ سار دهات .. چەقچەقا ددانێت من بو ، کرکەك د هناڤێد من دا بو ، ژ سەری هەتا بنی ئەز دلەرزیم وەکی بیها د ئاڤێدا ، زەلام هەلباسکی وان گرا ببون و هندەکا دکرنە غارو دبەزین ژ ڤی گری بو بێدی ، بەلێ من چ کەو نەددیتن و ئەز دبێژم هەما وان ژی دویرڤە ددیتن ، بێهنەك پێڤە چو با زورتر لێهات و شلوڤا بەفرێ لگەل هات و دونیا بو مژو مروڤی ژ ڤێریێ و ڤێڤەی سێ چار پێنگاڤەکا هەڤالێ خو نەددیت ، حلکە حلکەك هاتە من و تبلێت دەست و پێت من مرن ، دەڤێ من لال بو و من های ژ سەرو چاڤێت خو نەما .

من هند گوهـ لێ بو هندەکا گازی دکر (ڕاڤ بەتالێ .. ڕاڤ بەتالێ) ، دیسا ئەو تولاز هەمی ژوان گرا هاتنەخاری و بەری خو دانە گوندی من ژی پێت خو ل دویڤ خو کێشان و بەرڤ گوندی چوم ، پشتی بێهنەکێ ئەز بێ حەسیام کو کالکا من ژ پێ من بو ، من خو چەماندو ژ ناڤ بەفرێ ئینا دەرێ و کرە پێ خوو دەست هاڤێتێ دا شروخا وێ گرێدەم ، ئینا بزدیا ، دەهـ بیست کالەکێت دی ئەز چوم سەح دکەمێ کالکا من ل پێ من نینەو ئەزێ پێخاسم ، من ل هندە جها ب زوری خو ژ بەفرێ دەرێ دخست ، نە هەرێ ئەز بێ هێز بوم و هندی هاتمێ نەشیام پێنگاڤەکا دی ب هاڤێم .. بیرا من و بەر سوپێ هات و من گوت خوزی نوکە ئەز ل بەر بامەو من دەستێت خو دابانێ ، بەلێ ئەز

لگەل ڤان خوزیا سەرو سەر چوم و کەتمە سەر دەڤێ خو ، هندەك هاتن و ئەز ڕاکرم و من گوهـ لێ بو وەکی دگوتن :

- دێ بابۆ دێ .. کا تو و کارەکەو .. ؟
- ما وان دای بابا چەوا هێلایە .. ؟
- کی دبێژیت بیێ وان نەهاتیە .. ؟

ئینا ئێك ژ وان ئەز دانامە سەر قلێقلدانکێت خو وئەز ب مال ڕا گەهاندم ، دایکا من ب لەز ڕابوو جلکێت من دبەر من دا ئینان و هندەکێت هشك کرنە بەر من .. هندە پاتە ئینان و دانە سوپێ و ب دەست و پێت من ڤە نان هەتا پیچەکێ خوین هاتیێ :-

- ما ئەز چ ل تەو بابێ تە ب کەم .. تو وەسا یێ خشکوکی .. کا ئەڤە حالە .. یا ژ تە ڤە فلیەك بو دا کەی .

ئەز کرمە دبن لحێفکێ ڤەو چەند گلدك و پاتە ب سەر من دادان ، هەتا ئەز نەشیام بلڤم دبنڤە ئەز دخەو چوم و ئەز دبێژم هەتا نوکە من چ خەوێت ژ وێ خەوێ خوشتر نەکرینە ، پشتی وێ وەستیانا من دیتی و سەرما من خواری ...

پشتی نیڤرو بو وەکی ئەز ژ خەو ڕابویم و ژ ناڤ نڤینا دەرکەڤتیم ، بابێ من یێ درێژکری بو و دایکا من ژی گورەك دکرو یا ل نك سوپێ پرونشتی بو ..

- ها مەژی هشکوتە خوار .. دێ هەڕە کارەکەوێ هەڕە .. تو گەلەکێ پێنگزبوی ل سەر دەستێت زەلاما وەکی تو ئینایەڤە ..

من دەمینەکر .. لێڤا سەری ل یا بنی نەدا ، ما دێ چ بێژم ؟ ئەز بێهنەکا خوش مامە پرونشتی ، پەلدا بچیکێت گوندی هاتە پشتا خانی و گازی من کرن دا بچینە ڕەخێت گوندی گولچکانێ ب کەین ، ئەز ڕاست ڕابومەڤەو من قەستا ژدەرڤە کر .. هندی دایکا من ل من حەیتاندو خوڕی و قەسە گوتن .. بەلێ من خو ل دەری داو ئەز دەرکەڤتم و ژدەرڤە من گوهـ ل دەنگێ وێ بو :-

- هەوارە .. ئەز چ ل خوو ڤی کوڕی ب کەم ، هەما یێ بخوب ڤێ شرپاتیێ بریە سەری ، بەلێ نە سوچێت تەنە ، سوچێت بابێ تەنە ، یێ ئەڤ ڕێکە دایە تە ..

- ئێ عەبدا خودێ ما دێ چ لێ کەین .. بچویکەو دڤێت بچیتە ناڤ هەڤالێت خو .. ما خونە دێ گرێدەین و قەیدا کەینە پیا .. بلا بچیت .. ئەو ژی وەکی بچویکێت خەلکی ..

پێدی من های ژ وان نەما ، ئەز ژ خانوی دویرکەڤتم و من دیت بچویك یێ بەفرێ د ئێك ودوو وەردکەن ...

وەرگێڕانی لە ئینگلیزییەوە

ئازاد عبدالله محمد

لە دوای ئەو جەنگە بەناوبانگەوە بەتەواوەتی ماڵ خۆیبوو بابەمارینیان[1] (ئەب مارینیان)ی پێبووتری. قەشەیەکی باریکەلەی باڵابەرزو تارادەیەك دەمارگیربوو بەڵام هیچ کاتێك نەبوو دادپەروەر نەبێت باوەڕەکانی جێگیر بوونو نەئەگۆڕان .. باوەڕی وابوو تێکەیشتنێکی هۆشیارانەی تەواو لەخوانەکات وچواردەوری تەنراوە بەپلانو ویستو ئارەزووەکانی . هەندێك جار کەبەڕارەوی باخچەیەکدا پیاسەی ئەکرد . لەوشارۆچکە بچکۆلەدا کەئیشی تێدائەکرد لەخۆی ئەپرسی «خوا ئەمەی بۆکردووە ؟» ئەنجا خۆی وائەهێنایە بەرچاو لەجێگەی خوادابێتو بەسەر کەشییەوە دەستی ئەکرد بەپشکنین نزیکەی هەموو جارێك خۆی ئەدۆزییەوە . بابەمارینیان لەو جۆرە پیاوانە نەبوو کە بەملکەچییەوە بچرپێنێ «خوایە ڕێگاکانت زۆر لەوە بەرزترن کەپیاو درکی پێبکات» بەڵکو ئەیووت «من خزمەتکاری خوام پێویستە هۆی ئیشەکانی بزانم ئەگەر نەشم زانی بەدوایدا بگەڕێم» وەوای بەخەیاڵدا ئەهات کەهەموو شتێك لەسروشتدا بەمەنتیقێکی بێپایانەوە دروست کراوەو شایانی سەرسوڕمانە . وەهەمیشە هاوسەنگییەك لەنێوان شتەکانو هۆکانیدا هەیە . بۆیە شەفەق هەیە بۆنەوەی خۆشی لەدەروونی مرۆڤدا بژێنێتەوە کاتێك بەئاگا دێتەوە ، ڕۆژیش بۆنەوەی بەرووبوم پێبگات ، شەوی نوتەکیش بۆنوستن ، چوار وەرزەش بۆتەواوی لەگەڵ پێویستیەکانی کشتوکاڵدا ئەگونجێ . شتێکی مەحاڵ بوو بابەمارینیان باوەڕ بکات کەسروشت بێئامانجەو هەموو زیندەوەرێك خۆی خۆی ڕادێنێ بەپێی بارە سەختەکانی وەرزو دەوروپشتو مادەکەش خۆی . بەڵام ژنی خۆش نەئەویستو لەناخەوە بەلاشعوری رقی لێیان بووو بەغەریزە ئەی بوغزاندن هەمیشە ئەوقسەیەی مەسیحی دووبارە ئەکردەوە : «ئافرەتان من چیمە بەسەرتانەوە» . وەخۆشی بۆی زیاد ئەکردوو ئەیووت . مرۆڤ ئەتوانێت بلێت خواش خۆی ڕازینییە لەئافرەت کەخولقاندوویەتی .

لەڕاستیدالای ئەو ژن هەروەکو شاعیرەکە ئەڵێت «منالێکە بەڵام کەلێك ناپاك» .

ئافرەت لای ئەو ئەوفێڵبازەیە کەیەکەم مرۆڤی

هەڵخەڵەتاندو ئاتێستاش جمو جوڵە نەفرەت لێکراوەکەی هەر بەردەوامەو ئەو خولقێنراوە بێ هێزە ترسناکە یە ئەبێتە هۆی دوو دڵی یەکی شاراوە . زیاتر قینی لەگیانی تینوویان بۆ خۆشەویستی ئەبووەوە وەك لەجوانی یە کوشندەکەیان . زۆر جار هەستی ئەکرد سۆزی ئافرەت هێرشی بۆدێنێ . گەلێك بێزار ئەبوو لەو خۆشەویستی یەی هەمیشەو هەتاهەتایە لەسنگیانەوە هەڵ ئەقوڵێ ، هەرچەندە ئەیزانی خۆی لە قەڵایەکی سەختدایە دوور لێی ..

باوەڕی وابوو خواژنی دروست کردووە بۆ ئەوەی پیاو هەڵخەڵەتێنێ‌و تاقی بکاتەوە ، بۆیە پیاو ئەبێ لێیانەوە نزیك نەبێتەوە تاچەکدار نەبێت بەو بەئاگایی یەی لە بۆسەدا پێ‌ی چەکدار ئەبێت ... لەڕاستیدا ژن هیچ نی یە . تەڵەیەك نەبێت بە قۆڵە درێژو دەمە کراوەکەیەوە لەچاوەڕوانی پیاودا .

بابە مارینیان تەنیا ڕێزی ئەو خوشکە ڕاهبانەی ئەگرت کەسوێندخواردن لەخۆشەویستی دای بڕیبوون ، لەگەڵ ئەوەشدا بە دڵ ڕەقی‌یەوە هەڵس‌و کەوتی لەگەڵدا ئەکردن . لای وابوو ئەوسۆزە نەمرەی لێ‌ئەدان ، هەتاڵە قووڵایی ئەو دڵە پاکانەشدا هەمیشە لێ‌ئەدا ... لێ‌ئەدات هەتا بۆ قەشەیەکی وەکو ئەمیش . وای هەست دەکرد ئەوسۆزەی لەچاویاندایە پتر لەهی ڕاهبەکان نەشئەی خواپەرستی تێدایە ، لەونەشئەیەی کە ئەگاتە سێکس لەو خۆشەویستی‌و شەوقە یاندا بۆمەسیح ، کە ئەمی‌تووڕە دەکرد چونکە خۆشەویستی یەکی ژنانەو لەش پەرستانە بوون وای هەست دەکرد ئەوسۆزە نەفرەت لێ‌کراوە ، هەتا لە کرنووش بردنیاندا ، لەدەنگە ناسکەکانیاندا کاتێك لەگەڵیا ئەدوان ، لەچاوە ماتەکانیاندا ، لەفرمێسکی مل کەچی‌یاندا کاتێك بەتووڕەیی‌یەوە سەرزەنشتی ئەکردن هەن‌و هەموو کاتێك کە لەدێرەکە دەهاتە دەرەوە ، دامێنی جلەکانی دەتەکاندو بەخێرایی بۆی دەردەچوو ، هەروەك لەشتێکی ترسناك هەڵاتبێ .

خوشکەزایەکی هەبوو لەگەڵ دایکیدا لەخانوویەکی بچووکی نزیك ماڵەکەی ئەمدائەژیان‌و بڕیاری دابوو بیکات بەڕاهبە . کیژۆڵەکە زۆر ناسك‌و ژیکەڵە بوو .

بەبەردەوامی‌و بەئەنقەست خاڵی تووڕە ئەکردو ئەینابە دڵی‌یەوە . ئەویش بەبێ ئاگایی هەوڵی ئەدا خۆی لەباوەشی ڕزگار بکات . لەگەڵ ئەوەشدا ئەو باوەش پیاکردنە لەدەروونی‌دا هەستێکی شیرینی ئەوروژاند . لەدڵیدا ئەو شعوورە نوستوەی بەئاگا دەهێنایەوە کە لە ناخی هەموو پیاوێکدا پاڵکەوتووە .

زۆر جار کەبەیەکەوە لە کێڵگەکان پیاسەیان ئەکرد ، باسی خوای بۆ ئەکرد ئەویش بەدەگمەن گوێ‌ی بۆ ڕائەگرت . سەیری ئاسمان‌و گژوگیاو گوڵەکانی ئەکردو چاوەکانی بەخۆشی ژیان ئەبریسکانەوە ، هەندێك جار ڕای ئەکرد بۆ ئەوەی پەپوولەیەك بگرێ ، کەپەپوولەکەی ئەهێنایەوە هاواری ئەکرد «خاڵە سەیرکە چەند جوانە حەزئەکەم ماچی‌بکەم» .

ئەم ئارەزووەی ئەو بۆ ماچ کردنی پەپوولەو گوڵ ، بابەمارینیان بێزارئەکردو ئەی‌وروژان .

بەڵگەی ئەوسۆزە هەمیشەیی‌یەی تیائەبینی کەلەدڵی هەموو ژنێکدالێ‌ئەدات . ڕۆژێکیان ژنەماڵ ڕێکخەرەکە بە بابەمارینیانی ڕاگەیاند کە خوشکەزاکەی دڵدارێکی بۆخۆی پەیدا کردووە . هەستێکی ئازاراوی چێشت .. بەهەناسە سواری‌و هەر بەکەفەکەی دەم‌وچاوی‌یەوە لەسەرڕیش تاشینەکەی وەستاو کاتێك توانای هاتەوە بەر خۆی هاواری کرد :

درۆیە درۆیە ... مالینا تۆ درۆ ئەکەیت .. بەڵام ژنە لادێ‌یی‌یەکە دەستی لەسەر دڵی داناو وتی : ـ گەورەم ئەگەر درۆبکەم خوا سزام‌بدات . ئەوهەموو شەوێك دوای ئەوەی خوشکەکەی ئەنووێت . ئەچێت بۆلای‌و لەتەنیشت ڕووبارەکە بەیەك ئەگەن .. هەر ئەوەندەی لەسەرە لەنێوان سەعات دەونیوی شەودابچێت بۆئەوێ‌و بەچاوی خۆی ببینێت .. بابە لەخوراندنی ڕیشی‌کەوت‌و کەوتەکێلانی ژوورەکە بەخێرایی هەروەك ئەوکاتانەی دەکەوێتە بیرکردنەوەیەکی قووڵەوە . کاتێك ویستی ڕیش تاشینەکەی تەواوبکات لەسێ‌لاوە ، لەلووتی‌یەوە بۆگوێچکەی خۆی بڕی . بە درێژایی ئەوڕۆژە

بەبێ دەنگی مایەوە . سەرلێو بوو بوو لەتووڕەیی و ورووژاندن . لەپاڵ ڕقە ئاسایی یەکەی بەرانبەر بەخۆشەویستی ، هەستیشی ئەکرد کەکەرامەتی ڕووشاوە . وەك باوك . مامۆستا ، پارێزەری دەروون ، هەستی ئەکرد کەوا کچێکی منداڵ فێڵی لێکردو گاڵتەی پێکردو شتێکی لێ زەوتکرد کەموڵکی خۆیەتی . هەستی بەم خەمە خۆپەرستانەیە ئەکرد کەدایك ، باوك هەستی پێ ئەکەن . کاتێك کچەکەیان هەواڵی ئەوەیان ئەداتێ مێردێکی بۆخۆی دۆزیوەتەوە بەبێ پرسی ئەوان یان دژی ویستی ئەوان .

دوای نانی ئێوارە ویستی تۆزێك بخوێنێتەوە ، بەڵام نەیتوانی خۆی ڕابگرێ لەسەری و تووڕەیی یەکەی هێندەی تر کەڵەکە ئەبوو . کاتێك سەعات (١٠) لێی دا . داردەستەکەی هەڵگرت کەڕیسێك بوو لەدار بەڕوو ، شەوان بۆ سەردانی نەخۆشەکان لەگەڵ خۆیدا هەڵی ئەگرت . بەزەردەخەنەوە ئەیڕوانی یە لیسەکەی کەلەمشتیا جێگیربوو ، بەهەڕەشەوە دار دەستەکەی لەهەودا ڕائەوەشاند ئنجا لەپڕێکدا بەرزی کردەوەو بە دان جیرکردنەوە کێشای بە پشتی کورسییەکداو تێکی شکاند .

دەرگای خانووەکەی کردەوە بۆ ئەوەی بچێتە دەرێ . بەڵام بەسەرسامی یەوە لەبەر دەرگاکەدا وەستا . جوانی مانگ دڵرفێن بوو ، دڵرفێنێکی بێهاوتا . گیانە بەرزەکەی بە دەورو پشتەکەی ئاشنابوو . لەپڕێکدا وای هەستکرد جوانی و بەرزی و بەهای ئەو شەوە ڕەنگ هەڵبزرکاوە دڵی بزواندووە .. لەباخچە بچکۆلەکەشیدا کە لە ڕووناکی یەکی کزدا مەلەی ئەکرد . درەختی میوەکان دکەچڵەداری ناسکی سەوز بوون و سێبەرەکانیان بەسەر ڕێڕەوی باخچەکەدا بڵاوکردبووەوە و لەو گوڵانە شەوە کە بە دیوارەکەدا هەڵزنابوون ، بۆنێکی بەتامی خۆش بەرز ئەبوونەوە وەك گیانێکی عەتراوی بەو شەوە گەرمە سافەدا هەڵوا سرابوو . کەوتە هەناسەدانی قووڵ .. کەوتە هەڵژینی هەوا وەك چۆن سەرخۆش شەراب ئەنۆشێ . بەهێواشی هەنگاوی ئەنا وەك سیحری لێکرابێت ، هەتاخەریك بوو خوشکەزاکەشی لەبیربچێتەوە .

کاتێك گەیشتە شوێنێکی بەرز وەستا سەیری ناو دۆڵەکە هەمووی بکات کە لەبەر دەمیا درێژ بوو بووەوەو جوانی مانگ لەئامێزی گرتبوو ، سیحری ئەو شەوە هێمنە بە سۆزەش نقومی کردبوو ، قیرەی بۆقەکانیش لەدوورەوە بەنەغمەی کورت دووبارە ئەبوونەوەو بولبولەکانیش لەدوورە مانگ خەمباری کردبوون و گۆرانی یان بۆ ئەووت ، گۆرانی یەکانیان تێکەڵی ئەو موسیقایە ئەبوو کە خەوبینینی ئەورووژان نەك بیرکردنەوە .

بابە بەردەوام بوو لە ڕۆیشتندا ، نەی ئەزانی ئازایەتی یەکەی بۆ وازی لێهێناوەو وای هەست ئەکرد هیلاکی و ماندووبوون ئاودزیان کردۆتە جەستەیەوەو ئارەزووی ئەکرد لەشوێنی خۆی دانیشێت یابوەستێت تا سوپاسی خوا بکات بۆ ئەم دەست کردەی . لەبەر چاویا بەدەوری پێچی ڕووبارەکەدا دوو ڕیزی درێژ درەخت کشابوون و لەسەر قەراغی ڕووبارەکە پەلە هەورێکی سپی ناسکی سپی مەلەی ئەکردو پرشنگی مانگیش تێکەڵی بوو بوو ، ڕەنگ و بریسکەی زیوینی پێ بەخشیبو . بابە جارێکی تر وەستاو شعورێکی بەهێزو گەورەتر ئەڕژایە ناخی یەوەو دوودڵی و گومان دەستی گرتبوو بەسەریاو هەستی کرد پرسیارێك لەو پرسیارانەی زۆرجار تەنگی پێ هەڵ ئەچنن بە مێشکیدا ئەسوڕێتەوە .. خوا بۆوای کردووە ؟ ئەگەر شەو بۆ سەر نانەوەو پشوودان و لەبیرچوونەوەیە بۆئەوەندە لەڕۆژ سیحراوی تر و لەخۆرئاوابوون و خۆرهەڵاتن جوانترە ؟ ئەم ئەستێرە هێواشە ئەندێشاویە کەجوانی یەکەی لەجوانی ڕۆژ پترەو زیندەوەران بە ڕووناکی یەکی ناسك ڕۆشن ئەکاتەوە کەلەتوانای ڕۆژدانی یە .. ئەم ئەستێرەیە بۆئەوە هاتووە سێبەرەکان ڕووناك بکاتەوە ؟ ئەی بولبولی گۆرانی بێژ ئەویش وەکو هەموو باڵندەکانی تر شەوان نانوێت ، ئەی بۆئەم هەستەی بەڕۆحدا ئەچێتە خوارەوەو ئەم تەمەلی یەی بەجەستەدا بڵاوئەبێتەوە ؟ ئەی بۆ ئەم سەرپۆشەی دای داوەتەوە بەسەر زەویداو ئەم سیحرەی مرۆڤ خۆشی لێنابینێ کاتێك لەشەودا ئەخزێتە جێگەکەیەوە ؟ خوا ئەم جوانی و شەپۆلی شیعرەی لەئاسمانەوە بۆزەوی هەڵئەقوڵێ بۆکێ خولقاندووە ؟ بابە هیچ وەڵامێکی بۆ ئەم پرسیارانە نەدۆزی یەوە کەلەناخیدا ئەورووژان .

بەڵام لەوکاتەدا دوو تارمایی لەوسەری لەوەرگاکەوە دەرکەوتن کەبەتەنیشت یەکەوەو لەژێر دەرەختە ملانگیرەکان و نقووم بووی تەمەزیویی یەکەدا پیاسەیان ئەکرد .

پیاوەکە درێژتربوو قۆڵی لەملی خۆشەویستەکەی ئالاندبوو ، هەرساتە ناساتێ ناوچەوانی ماچ ئەکردو لەپڕێکدا

ژیان بەبەری ئەوسروشتە ویرانەیەی دەوریاندا هاتەوە ، وەك چوارچێوەیەکی خوایی بێت و تایبەت لەپێناوی ئەواندا دروست کرابێت .

هەردووکیان وەك بوونەوەرێك دەر ئەکەوتن ، بونەوەرێك کـە لە پێنـاوی‌دا شـەوی هێمن و بێ‌دەنـگ خـولقێنـراوە . نـزیـك‌بـوونـەوە لەقـەشـەکـە وەك وەلامێکی زینـدووی پرسیارەکەی ، وەلامێك خوای مەزن بۆی ناردبێت ، بابە بـە ئەبلەقی یەوە وەستاو دڵی بەتووندی لێ‌ی ئەدا . چیرۆکە کانی ئینجیل وەك چیرۆکی (ڕوث و بۆز) وهێنانە دی ویستی خوای لەم چیرۆکە بەنرخانەی کتێبی پیرۆزدا هاتەوە یاد .

لەسەری قەشەکەدا سـروودە ئاییني‌یـەکان ، بـانگی بـەدەن ، شیعـری جـوانی ئـەم چـامـەیـەی کـە لە سـۆزو خۆشەویستی‌دا قوڵپی ئەدا ، دووبارە ئەبووەوە . بەخۆی وت ئەوانەیە خـوا شەوی ئـاوا وەك چوارچێـوەیەك بـۆ نموونـە بەرزەکانی خـۆی ... بۆ خـۆشەویستی مـرۆڤ بخولقێنێ» . گەڕایەوە دواوە دوور لەدوو خۆشەویستەکە کـە دەست لەناو دەست نزیك ئەبوونەوە . لە ڕاستیدا خوشکەزاکەی خۆی بوو . ئا ئیستا بابە مارینیان پرسیار ئەکات ، ئـەی خەریـك نەبـوو لەپـەیـڕەوی خـوا دەرچـێت ؟ . ئـەگـەر خـوا خـۆی لە لەخۆشەویستی ڕازی نەبێت ، بەو چـوار چێوەیـە لە جوانی دەوری نەئەدا .

بابە بە سەر سامی یەوە هەڵات ! خەریـك‌بوو هـەست بەشەرم بکات ، هەر وەك بە پەیکەرێکی پیرۆزدا ڕەت بووبێ کەماڵ پیاڕێشتنی نەبێت .

ئەم چیرۆکە لە کتێبی

88 SHORT STORIES BY
GUY DE MAUPASSANT

وەرگێردراوە .

بكر حسن

1963

ئـەمجارەیـان زۆر بێ‌ئارامی ... « بێ‌ئـارامی » چاوەکـانتی بێ‌زەق کردوویتەوە چی‌دەبینی ؟! تاچاوبڕکات .... بیابانێکی دوور ... زۆر دوور ..... وەك چاوی ئەو .... قژی درێژی پڕلە نـهێـنی ئـەو ... ڕەنـگ زەرد ، وەك ڕەنـگـی دەم و چـاوە چرچبووەکەت .. دەڵێی ئەبەد تاوێ باران نەباریوە بەسەریدا ، کۆتاییەکەی ئـەوەندەی چـاوت فریـای کەوێ تـەپ و تۆزێکی زۆرلێڵە .. تـەمێکی زۆر خـەست و چـڕ دیـارە .... لێڵە وەك چاوانت .

ئەمشەو دڵەکەت دوو هێندەی کێشی خۆی زیادی کـردووە ..

(1) بابە لە جێگـەی (....) کە مـانای (ڕاهب)ە . بـەکارهـاتووە ، ووشـەیەکـە لە ئینگلیزی و فـەرەنسی‌دا بەکـار دەهێنـرێت ، هەروەها لە عەرەبیشدا بەکاردێت .

واهەست دەکەی پارچەیەك غەمی قورس و ڕەقە ... خـواری کردووی بەلای چەپتدا ... کەدەچیتە سەر چەرپایەکەت گلۆپە نـەعلەتیـەکـەی بـەردەم ژوورەکـەت ، چـاوەکـانت والیّ تووڕەدەکا .. هەرچی رووناکی دنیا هەیە بەنەفرەتکەی ... هی مانگ و ئـەستێرەکـانیش . جیرەجیـڕی چەرپـایەکـەشت دووهێنـدەی تر ژمـارەی مێشولە دەبـەنگ و زلەکـانت لیّزیاد دەکەن .. لەسەردەم خۆت دەدەی بەسـەر چەرپـاکەتـدا .. قاچەکـانت کۆدەکـەیتەوە .. دەستـەکانیشت وەك چـاوەکانت لەژێـردەم و چاوتـدامـات دەدەی ، لەتـرسی مێشـوولەکـان ، ئینجادڵەکەت تـەنگت پیّ هەڵدەچنیّ ، بیّـزارت دەکا ، تـووند سنگت پێـدەنـووسینیّ بـەچـەرپـایـەکـەتـەوە . ـ ئـای دڵە نەعلەتیەکـەم ... تۆئـەمشەو بـۆئەوەنـدە گەورە بـووی ... خۆواپەراسوە سنگم خەریکە لێك دەترازیّ . ئاواهەست دەکەی سنگت جیگای دڵەکەتی تیانابێتەوە .. بۆیە هەڵدەستیتەوە .. وەك چاوەڕوانی شتێك بکەی دادەنیشی .. گەرجگەرەیەکت پیّ بـووایە چـاوەکانت ئـامێکیان پیـادەهاتـەوە ، ئەو مێشـوولە دەبەنگ و زلانەش بەدوکـەڵەکەی هـەندیّ دوور دەکـەوتنەوە ئەوەندەش گوێت لەدڵە لەرزۆکەکەت نەدەبوو ، چونکە مێشکە پڕلەزووخاوەکـەت هەنـدیّ ئارام دەبـۆوە ... لەهەمـووشیان گەورەتر ... بۆماوەیەك فرمێسکە بەکوڵەکانی ژنـەکەت لەبـیر دەچۆوە ، کەلەماڵ ئاواییداوەك شەپۆلی ئاوێکی بەرمانکەشەو بەڕوومەتەکانیدا دەهاتەخواریّ ... گلۆپە نەعلەتیەکە چـەند ئازاری‌دەدا نایەلیّ هەنورکەیەك بچنەخەو .. ماوەکیشـە وەك یەکێك‌لە دەمارەکانی دڵت ، جارجار بگیریّ ، ئاوایە .. بەتەکان خوێنەکەت ڕیّڕەوی خۆی‌بکاتەوە قـورس دەبیّ .. ئەوەنـدە بەکەشکە پیاکێشاوە ... دەڵیّی کۆمەڵێك لەمێشوولە دەبەنگ و زلەکان پیایا نیشتوونەتەوەو بەرگازیان داوە ، گەرئاوا بەچاوی پڕفرمێسکەوە بەجێت نەهێشتایە ، ئێستاجۆرێکی تر دەبووی . کەبەجێت هێشت بەدەم گریانەوەپیّی ووتیت : ـ بچۆ بۆلای دوکتـور .. لەبیرت نـەچیّ !! یەکـەم جارتـە کـەسێـك ئـاوا بەدلسۆزیەوە پێت بلیّ بۆلای دوکتۆر ... ئای کەخـۆش بوو لات ... کـەخەریکـە وەنـەوزێـك دەچێتـە چـاوەکـانتـەوە ، لەسەرپشت پاڵدەکەوی .. گلۆپی بەردەم ژوورەکەت دەڵیّی لەچاوەکانی تۆدا داگیرساون ، دەڵیّی هەمـوو ڕووناکی دنیـا لەچاوەکانی تۆدا کۆبۆتەوە ، چاوەکانت خەریکەدەسـوتین .. دەتەویّ هەستی بیشکێنیّ .. خوانەخواستە کـەسێك چـاوی لیّبیّ ئەوە نەك پێت دەڵیّ « منداڵە » پێشت‌دەڵیّ « شێتە » گەر بـەرگـویّی یـەك دووکـەسی تـر بکـەوێتـەوە .. ئـەی خـاك بەچاوانت .. ئەبەدڕووناکی نابیننەوەو تامـاین .. هەرتـاریك دەبن .!! چەرپایەکەت جیّ دێڵی‌و هەندیّ بەژوورەکەتدا دێیت و دەچیت ،

ـ بۆچی هەستام .. ئەمەچی بوو . جیرە جیڕی چەرپایەکەت دانەکانت پیّ جیر دەکەنەوە .. خۆکورسیەکیش‌نی‌یە لەسەری دانیشی .. تۆهەر بەختت لەچەرپای جیرە جیڕ کەرو شکاوە .. چەرپایەکەی ماڵەوەشتان هەروایە .. هەموو جـار خۆزگـەت بەوە دەخوارد کەلەنێوان هـەردوو مێزی ئـاسمان و زەوییـدا بنوستیتایە ، دووساڵە بەژنەکەت دەڵیّی ئەم مانگە نـا ئەوی تریان چەرپایەك لەو دوانزە دینـاریانـە دەکڕم .. مـانگی سیّ دوانزە دیناریت دەدابەعەرەق و دەتخواردەوە ، هەرنەتکڕی .. هەموو شەویّ کەللە سەرەکەت تێردەکرد . بۆئەوەی کەبەیانی هەستای لەخەو .. قاچەکانت زەوی‌بگرن و بتوانی ڕیّبکەی .. ئـەم عارەقـە دوابڕاوە چی‌بـوو فێری بـوویت ، گەرشـەوێك نـەتخواردایـەتەوە چـاوەکانت لیّ سـوور دەبـوون و خـەڵك و هاو ڕێکانت دەکەوتنە پلارو تـوانج لێت : ـ بـەخوا بـەری نەداوە هێشتا .. سەری هەرگەرمە .. کورە بەخوا هەر ئەوچاك دەکا .. پشتی‌بەدنیاوە نایەشیّ . بەیانیان تادەگەیشتە دایەرە سیّچوارجگەرەی بەغدا ـت بەقورگتدا دەکرد . ئەوەندە کەللە سـەرەکەت پیّویستی پیّی بـوو ، گیانت دەکـەوتـە لەرزین هەروەك تلیاك خۆرەکان . خەریك بوو پێست بەلێـوەکانتـەوە نەیەلی .. ئەوەندە لێوەکانت دەدایەبەر شالاوی ددانەکانت . بەلام ئەوشەوەی دەتخواردەوە .. بەیانی زۆر زوو هەڵدەستای سەرت بەملا دەشت ، وەك دڵدارێکی زۆر سووتاو ، کەپەلەی ئەوەی بیّ .. زۆر زوو بگاتە دڵدارەکەی .. کاتژمێرێکی تەواو لەسووچێکی نزیك بەماڵەکەیان چاوەڕیّی بکا .. و لەسەر میلی کاتژمێرێکی تەواو سەمابکا ، بۆ ئەوەی دەم و چاوی بەوێنەی مانگ بێتەدەرەوە .. هەرچی غەم و ئازاری ئەوشەوەی هەبوو بیخاتە دووتوێی هەناسەی ئەوەوە .. نەبا بیری بچێتەوە !.. دەکەوێتە سەردەم .. دڵە نەعلەتیەکەت پەلە پەلیەتی دەڵیّی هـەرچی پۆلیسی دنیـا هەیـە بەدوایـەوەن .. تۆقـەد حـەزت بەڕووناکی زۆر بەهێزو سپی نـەکردووە .. هـەمیشە حـەزت

کردووە ڕەنگەکان تێکەڵاوبن .. لەناویەکدا بسووتێن .. هێمن ، هێمن ڕەوتدابن . پشتی هەردوو دەستت بەیەك دەخورێنێ .. قاچەکانت بەسەر چەرپایەکەدا شۆڕ دەکەیتەوە . هەمووی چەند ڕۆژێکە ... چەند خۆش بوو ئەوشەوەی بۆبەیانیەکەی دەهاتی بۆئێرە ، تێر بۆت گریا . گریانی عاشق لەشەودا وەك زکری دەرویش وایە لای‌خوا .. گریانێکی بەکوڵ ... لەهی دەرویش بەکوڵتر وەك گریانی منداڵێك بەدوای دایکیان .. وەك عاشقێ کەدەسگیرانەکەی کۆچێکی ئەبەدی لەپێش‌بێ ، زۆر جوانتریش ئای کەپێت‌خۆش بوو . لەگەڵ هەموو هەناسکێکیدا زەردە خەنەیەك بەلێوەکانتەوە دەنیشتەوەو .. موچرکێکیش لەمووچرکی هەناسەیەکی گەرم‌و تاساوی شەوانی دەست لەملانی پێشووت خۆشتر !! سەرتاپای گیانتی ماچ‌دەکرد .. دەتووت چیرۆکێکی پڕ لەهەناسەی ساردی- شیرین - وکۆچە ئەبەدی‌یەکەی - فەرهادت بۆ دەگێڕنەوە .. ئەو فرمێسکە گەرمانە بەڕوومەتەکانیدا دەهاتنە خوارێ .. شەرمی لەمامەکەشی نەدەکرد .. تەنانەت لەدایکیشی .. تۆ جارجار پێت دەووت :

- دەبێ زۆر جار - ئینسان - لەخۆی گەورەتربێ .. لەبەر ئەوەی شتەکانی ژیانی - ئینسان - هەندێ جارئەوەندە دڕندەن گەر ئینسان لەشێوە ئاساییەکەی‌و خۆیەوە تێیان بڕوانێ « دەیخۆن » .

هەروەکوو ئەمەندەبزانی حەزیشت دەکرد بگری .. زۆربگری .. زیاتر ، بەکوڵتر .. جوانتر چونکە هەستت بەبوونت دەکرد هەستت دەکرد هەیت .. یەك پارچە بوو بوویتە گریانەکەی ، هەموکیانت لەخۆشیاندا پێ‌دەکەنی .. دەتووت جاری جارانەو لەخوار دەرگاکەی ماڵی باوکیەوە وەستاوی .. ئەوەندەت دەزانی دێتە دەرەوە ! یەکەم جارتە ببینی لەنزیکەوە کەسێك ئاوا بۆت بسووتێ .. کەئەبەدیش لەدوورەوە نەتبینیوە .. خۆکە دایکت مرد هەر ئاگات لێ‌نەبوو .. نەخوازەلا بیرت بێ کەچۆن بەساقەو بەقوربانت بووە .. تەنها ئەو ڕۆژەت لەبیرە کەتابووتە باڵابەرزەکەی لەحەوشەکەدا دانرابوو .. ئاخر گەر ئەوە نەکبەتیت نەبێ بۆ هەر ئەوەت لەبیرە .. ئێستاش نازانی دەم‌و چاوی چۆن بوو .. ئەوەندە منداڵ بوویت .. کەمرد .. بەڵام ئای بۆ ئەوشەوەی کەبەحاڵ لەبیرت دێ . ڕەشەبایەکی‌سارد . دەچوون بۆماڵی خاڵت .. ئەویش عەبایەکی ئەستووروو درێژی دابوو بەسەریدا پێت ووت « دایە .. سەرمامە . » ووتی : -وەرە دایکت بەقوربانت‌بێ .. وەرە .. دەی .. ئائاوا .. ئێستا گەرمت بووە .

ئای کەژێر عەبایەکەی گەرم‌و خۆش بوو .. کەبەلەزەت بوو .. چەندیشت پێ‌خۆش بوو کەلەتوی ئەوعەباڕەشە قەترانیەوە گلۆپی دارتەلەی شەقامەکانت دەبینی زۆر بەهێمنی دەسووتان .. لەوساتەوە حەزت بەگلۆپی کەم ڕووناکی هێمنە .. هەرچۆنێك‌بێ دایکت تاوانبارە .. لەبەر ئەوەی زۆر زوو مردوو بیرەوەریەکانی منداڵێتی بۆنەگێڕا یتەوە .. باوکیشت خۆ خواخۆشی‌کات ئەوە پاش سی‌وپێنج ڕۆژ ژنی هێنایەوە .. نەیهێشت چلەکەی دایکت بچێ . پاش پەنجاو پێنج ساڵ تەمەن‌و هەر دڵی تەڕبوو .. لەبیرەوەریەکانی منداڵی خۆت بێ‌بەش بووی .. بۆیە ئێستا خواخوای ئەوەتە زوو کوڕەکەت گەورەبێ .تابیرەوەریەکانی منداڵی خۆی بۆبگێڕیتەوە .. تاقاقا پێ‌بکەنێ .

ماندوو دەبێ .. چاوەکانت مات دەبن .. بەڵام هەرچی قاچ‌و چاوت‌و دەستەکانت هەیە . جێگا گازی مێشوولە دەبەنگەنکانە . دەبێ ئیمشەو کۆدەتایەکیان بەدەستەوە بێ‌و شان بەشانی گلۆپە نە علەتیەکەو دڵە قورسەکەت دمیانەوێ سەرت پانکەنەوە .. لەبیرەوەریەکانت بسەننەوە . بەڵام فرمێسکە گەرمەکانی ژنەکەت لەچاوەکانتا سارد نابنەوە .. لەبەر ئەوەی هەر ئەوان شك دەبەی ، هەرئەوانن دان‌بەبوونتا دەنێن . واخەریکە گڕ لەچاوەکانت بەردەدەن . چاوەکانت پڕن لەگڕ ، گریای تێر .. تێر .. بۆدیداری .. بۆدووریەکەی .. بۆ گریانەکەی .. بۆ هەنسکەکانی ، بۆچاوە جوانەکانی .. بێ‌ئەوو بێ‌چاوەکانی‌و بێ‌حەسرەتی ئەوچیت .. لەو بەکوڵتر گریای .. بەڵام لەوجوانترنا .. لەبەر ئەوەی ئەو کەسانێك هەبوون لەبەردەمیا بۆی گریابن .. دەزانی مانای گریان چی‌یە .. دەزانی گریانی جوان ، دڵۆپ .. دڵۆپ .. زۆر بەهێمنی .. هەروەك نهێنی ئەستێرەکانی ئاسمان بۆزەوی .. ئاوا فرمێسکەکانت دەڕژانە دەمە لێو ئەستوورەکەتەوە .. وەك چۆن کەنار دەم دەنێ بەشەپۆلی گەرمی بەرەتاوی ڕووبارەوە .. دەمت پێوە نان .. هەموویانت خواردەوە .. تامەست بووی .. تاتێربووی .. کەخەوت لێ‌کەوت .. گلۆپەکان هەر دەسووتان بەڵام ئاگات لەمێشوولە دەبەنگەکان‌و دڵە لەرزۆکەکەت نەما ..

# گوڵە پەڕێک

شێرزاد حەسەن

+ هێرۆ هەبوویت ...
+ بۆ دابەش بوویت ... ؟!
- هێرۆ ون بوویت ...
● تەواو .. نەمایتو ... نیت !



دەی ئەو پەنجەرەیە بکەرەوە .. گوڵە مۆرەکانی ناو هەردوو ئینجانەکە ئاو بدە .. خەمی منیش .. ترسی جودایی بڕەوێنەوە .. لەسەر ئەم بانە نیمچە تەپیوەدا وشك بووم .. چاوەڕوانیو تاسەی ڕووە جوانەکەت پەکیان خستووم .. دە وەرە نێو بالکۆنەکەو سەرێ خوارکەوە .. وەك خۆری هاوینی نیمرۆ ئێوارە دەرکەوەو ئیتر ون بەو مەیەرەوە .. تامەزرۆتم هێرۆ گیان .. لە یادچوونەوەی تۆ قورسە وەك مەرگ .. بۆشایییەکە بەقەد بۆشایی نێوان ئەستێرەکان .. خەمێکە بەقەد هەندرێنو هەڵگوردو پیرەمەگروون ...

چیم لێ دەکەی .. چیم پێ دەکەی .. بۆکێ جێمدێڵی ؟ تۆ فریم بدەی .. کەسێ نابێ منی چڵکنو خۆشینەدیدە هەڵبگرێتەوە .. تەنها خۆت منی تاڵو ترشت تام دەکرد .. هێندەی باڵای تۆخۆر ماوەیەتی ئاوابێ .. خۆم بۆنەگیراو هاتمە سەربانەکە .. حەزت سەرشێتی کردوومو خەریکە منی برسیو شەرمنو ترسنۆك دیواری ئەستووری شەرم دەڕمێنم .....

پەنجەرەکە بکەرەوە .. سەرێ خوارکەوەو بڕوانە سەربانە بێنازەکەی ئێمە .. لە هەموو لایەکەوە دڕكو گیای زەردو سیسو وشکەو (با) دەیانباو دەیانهێنێ .. هاتووم‌و چاوەکانم بەسەر ئەو تاقو پەنجەرەو دارو بەردو دوو ئینجانەکەی سەر بالکۆنەکە ڕاون .. دە تۆش کەرەمکەو پەنجەرەکە بکەرەوە .. هەفتەیەکە ئەم پەنجەرە گەورەیەت داخستووە .. هەفتەیەکە پەردەکانیش دادڕاونەتەوە .. تۆراویتو نایەیتە ناو بالکۆنەکە .. وەك جاری جاران کورسییەکە دانانێیتو بەرامبەر هەردوو ئینجانەکە دابنیشی .. ئەوسا چەند بەختەوەر بووم .. هەموو ڕۆژێ دووسێ جار بەو ڕووخسارە گەشەت مەست دەبووم .. کە تۆ گوڵە مۆرەکانی ناو هەردوو ئینجانەکەت ئاو دەدا .. هەستم دەکرد دڵی من یەکێکە لەو گوڵە مۆرانەو تۆ تێر ئاوی دەکەی .. خۆزیا چیرۆکنووس بوومایە .. ئەوسا دەتدی چ چیرۆکێکی جوانو غەمگینی ئەم

ئەوینەم دەنوسی‌یەوە .. چیرۆکی ئەو گوڵە سیس‌و ژاکاوانە .. تۆران‌و دووریت .. تاسەو سووتان‌و شەونخونی هەفتەیەکم .. خەم‌و ژان‌و حەژمەتی تەنیایی .. بڕینی جودایی .. ماتەمینی .. بێزاری‌و بیرەخواردنەوەو مەستی تاڵ .. گریان‌و شتی‌تر .. حەزیشم دەکرد ناوی چیرۆکەکەم هەر بەناوی ئەو گوڵەمۆرە بووایە .. بەلام ئەوەتانێ ناوی ئەو گوڵەمۆرەش نازانم .... مادۆنیا .. پاتۆنیا .. دالیا .. مینا .. مانۆلیا .. خۆ من هیچیان لە یەکدی جویٚ ناکەمەوە .. دوور بە دووری دەیانبینم‌و بۆنیان دەکەم .. هەر دەڵێی حەژمەت‌و حەسرەتی حەزی تۆن .. وەك ماچەکانی دونیای ڕەشی خەیاڵم شیرین‌و سەرمەستم دەکەن .. کات‌و شوێنیش دەسڕنەوە .. دەزانم گوڵ گەلێ زۆرن .. بەقەد ئافرەتی شەنگ‌و شۆخ بەم دونیایەدا بڵاو بوونەتەوە .. کەچی من ناوی زۆر کەمیان دەزانم .. بمبورە هێرۆ .. گوناهی منی تیا نی‌یە .. من تەنها ئاشنای گوڵە تەمەن‌کورتەکانی ڕوولکی سەرشەقامەکانم .. گوڵی وردی مورتکەکان‌و هیچی تر .. منیش وەك خەڵکی دیکە حەز دەکەم هەموو گوڵ‌و مەل‌و درەخت‌و گیای ئەم وڵاتە بناسم .. بەلام کەی لەبەر ئازارو خەم‌و دەردی خۆم‌و مرۆڤەکانی سەر ئەم زەمینە دەپرژێمە سەر ناوی گوڵ‌و مەل .. هۆ زۆرن .. ئاخر باخچە کۆنەکانیش وێران کران‌و بوون بە خانووی گەورەو زەبەللاح .. کران بە شۆستەو شەقام .. دەزگاو باڵەخانە .. ئوتێلی دە نهۆم‌و بیست نهۆم .. تێکدران‌و وێران کران .. وەك ئەو دڵە کەلاوەی من بوون بە خاك‌و خۆڵی ژێر پێی ڕێبواران .. شارستانیەتی‌یەکە هات‌و هەموو شتی کرد بە خشت‌و بەردو کۆنکریت .. خەریکە دڵی هەزارەها شۆخی وەها تۆش بکا بە بەردو کۆنکریت .. دڵێکی کۆنکریتی کەی بۆ گۆرانی عیشق‌و ئەوین تلاوەتەوە ..؟ کەی بۆ چیرۆکی برسێتی‌و نەهامەتی داخورپاوە .. ؟ حەوشەکەشمان ئەوەندە تەسك‌و تروسکە جێی دوو گوڵەباخی لێ نابێتەوە .. تەنها یەك بنەمێوی تیایەو ئەویشیان زڕە .. پایزان گەڵا زەردەکانی وەك فرمێسکی تەنیایی‌و غوربەتیم هەڵدەوەرێن .. دەبارێن .. ڕەشەبا دەیانباو دەیانهێنێ .. هەموو درەختێك .. هەموو گوڵەباخێ لە حەوشەی لات‌و هەژارانا زڕەو هیچ ناگرێ .. دوو کولانەیەو بەس .. ژمارەیەکی زۆر لە منالی سەرکەو بنکە .. هیچ‌نەزان‌و نەخۆش‌و برسی‌و دەم‌بەهاوار .. تف‌و جوێن‌باران .. زستانان حەوشەکە قوڕو لیتەیەو هاوینانیش خۆڵەپۆکەو هیچی‌تر ... چۆن کەوتووینەتە نێو ئەم گەڕەکە خاوێنەی خواپێداوەکان ..؟ نێو ئەم هەموو کۆشکە قەشەنگ‌و ڕەنگاو ڕەنگانە ..؟ برادەرە دەوڵەمەندەکانی گەڕەك زوو زوو پێم دەڵێن : کەی تێکی دەدەن ؟ کەی ئەم تەویلەیە دەکەن بە شت ؟ مڕ دەبم‌و قسەکەی ئەوان لە دڵم کار دەکا .. چارم نی‌یە .. وەلامی پرسیارەکەی ئەوان گۆرانێکی مەزنی گەڕەکە .. بە تەقاویتی‌یەکەی پیرەباوك هیچمان بۆ ناکرێ .. کەس تێمان‌ناگا .. نیمانە .. هەقتانە تێ‌نەگەن .. لە منالی‌یەوە فێرە وشەی (نی‌یە) نەکراون .. هێرۆ گیان : من یەکەم وشەی کە فێری بووم‌و هەرگیز لە بیرم ناچێتەوە : نی‌یە .. نی‌یە .. (نی‌یە !) بوو ....

عانە ؟.. نی‌یە .. پێڵاو ؟ نی‌یە .. کراس ؟ نی‌یە .. بووکەشووشە ؟ نی‌یە .. پاسکیل ؟ نی‌یە .. نان ؟.. نی‌یە .. ئاگردان ؟ نی‌یە .. گوڵ؟ نی‌یە ..

گریان ؟ هەیە .. خەم‌و دەردو ژان ؟... هەن ! گەر ئێستاش هاوینان نەچمە مەیدانی قوڕکاری .. دەبێ زستانان خەون بە ئاگردانێکەوە ببینین .. وا نەبێ زانکۆکەشم بۆ تەواو ناکرێ .. قەڵەم‌و کاغەزێکم بەدەستەوەیەو هیچم بۆ نانوسرێ .. دووریت ئیفلیجی کردووم .. هەتا لە نەخۆشی ئەم حەزمەت ساغ دەبمەوە زۆری دەوێ .. هونەرمەندێکی کارامەو دەست‌ڕەنگینیش نیم تا بتوانم ڕەسمی گوڵەمۆرە مردووەکانی ناو هەردوو ئینجانەکە بکەم .. ئالۆزم‌و مێشکم گەلێ جەنجاڵە .. بەلام چاك دەزانم .. دەوڵەمەندەکانی شار .. ئاغاو کوێخا دەرکراوەکان .. قۆنتەراتچی‌و بازرگانە قەبەکان .. ئەوانەی دەزانن دینارێك بکەن بە دەو .. دەش بە سەد .. ئەوانە ناهێڵن‌و نەیان‌هێشت‌و لەمەودواش ناهێڵن من ناوی ئەو گوڵەمۆرە بزانم .. هەموویان دزی .. لە باخچەو بەچواردەوری چیمەنە پان‌وبەرینەکانیان چاندویانن‌و شاردویاننەوە .. ئەوان گوڵی مۆرو سوورو زەردو سپی .. گوڵی بۆن‌خۆش‌و بێ‌بۆنیش دەشارنەوە .. تەنها لە باخی شاردا دەتوانم گوڵێکی زۆر ببینم‌و بێ‌ئەوەی بوێرم لە ناویان بپرسم .. ئاخر ئێمە بۆ قوتووی شیرو ماکیاج‌و دەرپێ‌و پێڵاوو خانووی چۆڵ‌و خەستەخانەو شێتخانەو چێشتخانەو ماڵی سۆزانی‌یەك‌و ئاودەسی مزگەوتێك لە یەکدی دەپرسین .. بەلام هەرگیز لە ناوی گوڵێك ناپرسین ..

ماوەیەکە لەویش گوڵیان نەهێشت .. چما مناڵە هارو شێتەکانی شارەکەم دەهێڵن خونچەیەك ببێ بە گوڵ ؟ چما دەهێڵن هێلکەیەك بترووکێو بجوقێ ؟ ماوەیەکە (باخی شاریش) دەرگای بە قفڵێکی گەورە داخستووە .. من .. تەنها گوڵێ لە نزیکەوە دیبم .. گوڵی ئاوا جوان .. ئەو گوڵە مۆرو ناسکانەی بەر پەنجەرەکەتە کە وا شیرینو جوان بەسەر شوورەی نزمی بالکۆنەکەدا پەرشو بڵاو بوونەتەوە .. هەموو ڕۆژێ لە سەربانەکەی خۆمانەوە نوێژم بۆ تۆو ئەو دوو ئینجانەیە دەکردو ئینجا دەچوومە خوارێ .. حەزم دەکرد هەموو گێتی ئەو گوڵە مۆرو خۆشەویستەی تۆ بڕوتێنێ .. نازانم ئاخۆ گوڵەکانت ئەوەندە خۆش دەویست یان بۆ دیدەنی من عەودال بوویتو چەندەها جار بەسەریانت دەکردەوە ؟.. هەر کامیان بێ ؟ من دڵم بە تۆو بەو گوڵە ڕەنگینانە دەکرایەوە .. کە شنەبایەك هەڵیدەکردو دەیدا لە ڕووم .. بۆنێکی خۆشی ئەو گوڵانەی بۆ دەهێنامو دەیدا لە کەللەمو دەیتاساندمو مەستی ئەو حەزەی دەکردم .. وام هەست دە ْرد بۆنی قژو سەرو ملی تۆیە .. بۆنی سینەو بەرۆکی ساوات .. ئای کە سەرمەستی ئەو ڕۆژانەم ..!

دە دەی پەنجەرەکە بکەرەوە .. من شەقم برد .. گوڵەکان ئاودە .. سیس بوونو پەلکیان هەڵوەری .. مەیانکوژە .. ئای کە دڵتەنگمو هیچم بۆ ناکرێ .. تۆرانی تۆ پەکی خستووم .. خەریکە دەمرم .. ئەم پەنجەرەیە بکەرەوە .. پەردەکە لادە .. لەم گەڕەکە ئاڵو والایەداو لەنێو ئەم هەموو خانەدانو پیاوە ماقوڵانە چەندە غەریبو بەرپەووتین .. هەموویان بە مۆنی سەیری منو پیرەباوکو دایکم دەکەن .. لە براو خوشکە چکۆلانەکانم دەخوڕنەوە .. تەنها کەسێ تۆ بوویت کە بە ڕووی ئێمە پێدەکەنیتو بەنەهامەتیمان دڵتەنگ بوویت .. ورەت دەدامێ .. تۆ ئاگردانی بەجێماوی پڕ لە خۆڵەمێشی ئێمەت بە پشکۆی خەندە گەرم دەکردەوە .. کاتێکیش لێم نزیك دەبوویتەوە خوێنێکی گەرمتر لە دەمارەکانما کەف دەکرد .. شەوانیش .. شەوانی هاوین کە لەسەربانە تەپوەکەی خۆمان ڕادەکشامو تۆم لەوبەرەوە دەدی .. وەك فریشتەیەکی چکۆلانە ناو بالکۆنەکەت جێنەدەهێشتو لەوێر ـە ورشەی کراسەکەتم دەبیست ختووکەو لەرزێکی خۆشو بەتام هەموو لەشمی دەتەنیو خەنی دەبووم .. وام دەزانی چی ئەستێرەی ئاسمان هەن ڕژاونەتە سەربانەکەی ئێمەو .. من یەك یەکەیانت بۆ هەڵدەدەمو تۆش لەوبەر دەیانگریتەوە .. هەر بەخەیاڵ دەستی تۆم دەگرتو بەنێو کۆڵانەکانی ئاسماندا و دەست لەملانێ گوزەرمان دەکرد .. کە تۆ ون دەبوویت .. من دەکەوتمەوە سەربانە ڕەقو وشکەکەی خۆمانو چاوانم پڕ دەبوون لە گریان .. کە ڕۆژ دەبۆوە تا ئێوارە خۆری هاوین دەیبرژاندمو هەر بێباك بووم .. چونکە تۆ منت خۆشدەویست .. ئەو گەرمەسێرەم لێ دەبوو بە کوێستان .. چۆن نا ؟.. ئەو کوڕە خاوێنو ناسکانەی دەرو دراوسێ بەخیلیان پێ دەبردم .. کەوتبوونە فستەفستو پلارهاوێشتن .. بیرتە ڕۆژێکیان ئاگری چ شەڕێکم لەگەڵ ـ ئاراس ـ دا هەڵگیرساند .. ئەو هەتیوە مێبازەی هەر لە ژن دەچێ .. دەمزانی دەورو خولی تۆی داوەو بە هۆڕنی ـ فۆلفۆ ـ کەی جارجارە سەغلەتی دەکردیتو شەڕی پێ دەفرۆشتی .. وام دەزانی ئەوەندە ساویلکە نیت .. حەز بە شیعرو گوڵو ئاسمان دەکەی .. حەز لە منی بێسێبەرو .. بێپەرو باڵ دەکەی .. نازانم بۆچی من .. منی ناشیرینو جلشڕ هەم زەویو هەم ئاسمانت بووم .. کە زانیت بەشەڕ هاتووم .. لێم زویر بوویتو وتت :

« ـ حەمە .. تۆ چۆن لە من دەترسێی .. سەگ بەمانگ وەڕین چی تیایە ؟ »

بەم قسەیە دڵی منت سارد کردەوە .. پاشان وتم : ـ

« ـ هێرۆگیان .. ئەوبێی وتم : خانووەکەتان لەنێو ئەم گەڕەکە جوانەدا دەڵێی دوومەڵەو لە ڕوومەتی هێرۆ هاتووە ! »

تۆش وتت : « سەری دای لە بەرد ! »

دیارە لای ئەوان ئێمە دوومەڵین .. بەڵام بۆ ؟.. گەر هەر هەژارێ دوومەڵێك بێ .. کەواتە دونیا هەمووی دەبێ بە یەكپارچە دوومەڵ .. ئەوسا خواپێداوەکان فریا ناکەون ئەو ملیۆنەها .. بلیۆنەها دوومەڵە بتەقێنن .. گەر بشیتەقێنن خوێنو کێمو زووخ بەسەر ڕووی جیهاندا دێتە خوارێ .. ئەوساش هەموو شتە جوانو خاوێنەکانیان لە ژێر لافاوی خوێنو کێمدا نقوم دەبن .. ئای لە عەقلیان ..! چما نازانن خۆیان دوومەڵن .. پیس وپڕ کێمن .. هەریەکەیان دوومەڵێکە بەقەد کێوێکی ڕەش .. هێرۆگیان : ئەوسا چیترمان وت .. خۆ من زۆر شتم بیرچۆتەوە .. ئەم گفتوگۆیەش شیاوی چیرۆکەکەیە .. کوانێ ؟ خۆ من هێشتا قەڵەم نەخستۆتە سەر کاغەز .. ئای خۆپەرستەکان چیتان لێ کردم ؟ هێرۆ تۆ هەر

بەڕواڵەت لەگەڵ ئەوان بوویت .. تۆ بوویت پەری ڕۆح و بێگەردو هەژاردۆست .. تۆ بوویت لەنێوان ئەم کوڕە خاوێن و باوێنانە منت ویست .. ئەو کوڕە شوشەیی یانەی وشەی (نی یە) یان نەبیستووە .. بە هەنگوین گۆش کراون .. ئەوانەی لە هەتاوی هاوین خۆیان دەشارنەوە .. ئەو گەنجانەی کراس و پانتۆڵ و پێڵاوە کۆنەکانیان بە من دەبەخشی .. زۆر جاریش ئەو شتانەم ڕەت دەکردنەوە نەبا تۆم لێ زویر بیت .. ئەگەرچی لات و بێدەرامەتیش بووین .. تۆ ئێستاش نازانی منی قەرەج خاوەن چ دڵ و دەروونێکم .. ئای .. لە نێو ئەوانەی تویست و دیسکۆو فلیمی ڕووت شێتی کردوون .. تۆ منی قوڕاوی و ناشارستانیت خۆش ویست .. جاران ویستبووت .. ئێستا کوانێ ؟.. بۆ پەنجەرەکەت داخستووە ؟ بۆ نایکەیتەوە ؟ وا هەست دەکەم چی پەنجەرەی دونیا هەیە بەڕووما داخراوە .. خۆزیا منال دەبوومەوە .. ئەوسا دەتدی چۆن ئەم پەنجەرەیەم بەردباران دەکرد .. دەمشکاند بۆ ئەوەی بە خاوو خێزانەوە بێنە ناو بالکۆنەکەو تۆ ببینم .. ئای کە تۆ دەبینم چیم بەسەر دێ ؟ دەشێ لەسەر شکانی پەنجەرەیەك بمدەنە دەست پۆلیس .. بۆتان دەکرێ بەگرتنم بدەن .. دادگایەکی گەورەو عاشقێکی بێدەستەڵات ..! هەر خۆشە بۆ چەند ڕۆژێك دێیت و سەیری منی تاوانبار دەکەی .. منی تاوانباریش نە دادگاو نە دادپەروەرەکەش بە پولێك ناکڕم .. تەنها سەیری چاوانت دەکەم .. ئەو چاوانەی حەز دەکەم بۆ من بگرین .. بەڵام ناگرین .. ئێستا گەورەم و وەك جاران چەتوونیم بۆ ناکرێ .. نابمەوە منالەکەی جاران تا بە دارلاستیکێك نیشانە لەو پەنجەرەیە بگرم و هەمووتان سەغڵەت بکەم ...

دە ئەو پەنجەرەیە بکەرەوە .. گەر بیکەیتەوە هەزاران گرێکوێرەی ئەم دەروونە داخراوەم دەکرێنەوە .. هەوری ڕەشی پڕ لە گریانی ئاسمانی چاوانم دەڕەوێتەوە .. وەك جاران پێدەکەنم و دەخوێنمەوە .. چی باری گرانی دونیا هەیە بەوپەڕی شادییەوە هەڵیدەگرم .. ئاخۆ دەبێ سەفەرتان کردبێ ؟ خۆ ئێوە هەرگیز لە ئاهەنگ و بەزم و سەفەروسەرخۆشی ناکەون .. ئەی بۆ شەوانە گلۆپەکان داگیرساون و تا درەنگانێ ناکوژێنەوە .. هێرۆگیان .. چی وای لێ کردی خۆت بەند بکەی ..؟ تۆش وەك زۆربەی کچانی ئەم وڵاتە نەخۆشی یە پیسەکە سەری لێداوی .. حەز دەکەی ئازارم بدەی .. حەز دەکەی بگریم و قوڕ بپێوم .. دەتەوێ گوێت لە نالە نالی شەیدابیم بێ .. دەتەوێ وەك دێوانە شێتی ئەم هەردو شاخ و کێوانە بم .. ئای کە دێوانەی کپ و بێشیعرو نالەی تەنیایی زۆرە ..! نا .. هێرۆگیان .. من بشکریم : بێدەنگ دەگریم .. فێر کراوین بێدەنگ بگرین و بمرین .. بێدەنگیش گۆرانی بڵێین .. بەدزییەوە حەز لە یەکدی بکەین .. شەو تا بەیانی چەندەها نامەی دڵداری بنووسین و .. ..بەیانیش لەگەڵ گزنگی خۆردا هەموویان بدڕێنین .. نەبا تیشك و هەتاوی خۆر بیانخوێننەوە .. ئێمە نەوەیەکین وەك شەمشەمەکوێرە حەز بە تاریکی دەکەین .. ئێمە لە نهێنی یەکانی خۆمان دەترسین .. من دەمرم و بێ ئەوەی کەس بزانێ تۆم خۆش دەوێ .. من هەر بەخەیال دەتکرمە ئامێزو .. ماچت دە ... نا ببورە .. تا ئێرەو بەس .. من کەی دەوێرم سەر هەڵبڕم .. هەر لە منالیمەوە لێتان دەترسام .. دەترسم : ـ

« ـ دایکە .. حەوشەکەی ماڵی چەلەبی گوڵێکی زۆرو جوانی تیایە !

ـ کەی دیوتە ..؟ چۆن ..؟ حەرامزادە چی تۆی گەیاندە ناو حەوشەکەی ماڵی چەلەبی ؟

ـ بەدزییەوە لەسەر دیوارەکەوە سەیریم کرد ..

ـ کوڕم عاقڵبە .. بەسەر دیوارەکانیان هەڵگەڕێ .. خۆ تۆ پشیلە نیت .. ئەگینا قاچت دەبڕنەوە .. ها ؟!! »

هەر لەوساوە دەترسێم .. لە ئێوەو .. ئەوان و .. هەموتان .. دەترسام گەر گوڵێکتان بدزم و ئێوەش بمگرن و هەردوو قاچەکانم ببڕنەوە .. ئێستاش وا هەست دەکەم تۆ گوڵێکی زۆر دەگمەن و قەشەنگی .. ناوێرم لای کەس ئەو حەزو ئارەزووە دەرببڕم .. لە هەمووتان دەترسام .. لەوانەی پێنج سەد مەترو هەشتسەد مەترو هەزار مەتریان خانووە .. ئاخر خوا هەڵناگرێ .. پێوانەی کۆلیتەکەی ئێمە پەنجا مەترەو بەس .. زۆر جار پێنجسەد دابەشی سەر پەنجا دەکەم.. کەواتە ئێوە دەیەها جار لە ئێمە گەورەترو بالاترن .. پێم بڵێ چی ترن ؟ خۆ ناکرێ بڵێی پاکترین .. ئەوەیان نا .. تۆ نازانی .. هەر لەوساوە من دەترسام قاچەکانم ببڕنەوە .. هەر لەو ساوە حەزم لە گوڵە سوورو زەردەکانی نێو باخچەی کۆشکەکانتان دەکرد .. هەر لەوساوە شێتی بۆن و ڕەنگی گوڵ و درەختی بالابەرزو هێلانەی نێو باوەشیان بووم .. ئەوەتانێ گریان قوڕگی توند گرتووم ..

ئەوساش دەگریام .. ئەمێستاکەش من هەر ئەو گوڵانە دەناسم کە شێت و منداڵەکانیش پێیان دەوێرن .. نێرگزو گوڵاڵەسوورەی دەشتودەری خوا .. بۆتان بکرایە تۆوی ئەو گوڵانەشتان دەبڕاندەوە .. تا بە تەنها لە نێو حەوشەکانی ئێوەدا بڕوێن و بەس .. ئەوساش کە منداڵ بووم هەر دەگریام .. دەگریام چونکە کۆترێك .. کوکوختی‌یەك .. بولبولێك .. هەر مەلێکی هەڵەتەو کێوی نەدەگەیشتە ئاسمانی حەوشەکەمان .. درەختێکمان نەبوو فڕندەیەك بێت و هێلانەی خۆی لەسەر خۆش بکا .. تا بەیانیان لەگەڵ جوکەو جریکەی خۆش و شیرینی لە خەوی پڕ ترس و خەونی جڕناو فڕنا وەئاگا بێین .. ئەم بنەمێوەی هەمانە زڕەو هیچ ناگرێ .. خاکی نەبوونی چی لێ دەڕوێ ؟!!

هێرۆ گیان .. ئەم پەنجەرەیە بکەرەوە .. سەرێ خوار کەوە .. وەك فریشتە .. فریشتەیەکی بێدڵ سەیرێکمان بکە .. پێم بڵێ تاکەی ئەو گوڵانە ئاو نادەی ؟ ئاخر کێ دڵی دێ گوڵ بکوژێ ؟ ئای لەو دڵە ئاسنینەت !.. ئەوساش کە منداڵ بووم .. بەیانیان زوو تەنەکەو بەرمیلی زبڵەکانتانم دەپشکنی .. لەگەڵ هەزارەها شتی پیس و بۆگەن گوڵی زەردو سوورم دەدی .. ئای لە بێزەوقی ئێوە ! بۆ هەموو شتێکتان بە گەنجی و بە گەشی و بە گەرمی دەوێ ؟.. کە پیر بوو .. کە سیس بوو فڕێی دەدەن .. عومری هەموو جوانی و حەزێك لاتان کورتە .. کورتە وەك چەخماخەی بروسك .. وەك شەونمی بەیانیانی هاوین .. ئەوساش کە شۆڕ دەبوومەوە نێو بەرمیلی مەزنی زبڵەکان خەم دایدەگرتم .. ئای کە بەخیل و ڕەزیل و قرچۆك بوون و هیچ شتێکی جوانتان بۆ من جێ نەدەهێشت .. بەرلەوەی لە خەوی لەعنەتیتان وەئاگا بێن من هەموو تەنەکەو بەرمیلەکانم پشکنی بوو .. منداڵ و گێل بووم .. شێتی زبڵ و گوڵ و گەندو گووتان بووم .. زۆرجاریش هەروەك بێچوە پشیلە لە ناو یەکێ لەو بەرمیلە مەزن و زلانە گیر دەبووم و بەزەحمەت ڕزگارم دەبوو .. تەنها من شەیدای ئەو بەرمیلە پیسانە بووم .. گەلێ نهێنی ئێوەی تیا بوو کە تێیان نەدەگەیشتم .. هاوینان توێکڵە شووتی و کاڵەکەکانم بۆ مانگا چڵێس و لەڕەکەی خۆمان دەبردەوە .. کەوچك و چەتاڵەکان بۆ دایکم .. گوڵە زەردو سوورەکانیشم بۆ خۆم گل دەدایەوە ...

دە ئەو پەنجەرەیە بکەرەوە .. پێم بڵێ ئەو گوڵەمۆرە چی پێ دەڵێن ؟ دەگەڕێم و تا تۆوەکەی دەدۆزمەوە .. دوو ئێنجانەی لێ پڕ دەکەم بە یادی ئەو حەزەی تۆ بەبێدەنگی مراندت .. هێرۆ گیان : تاکەی گوڵی زۆرتان هەبێ ..؟ من بەخیلی بە سامان و دارایی هیچتان نابەم .. بەڵام گەلێ بەخیلی بە حەوشەی پڕ درەخت و گوڵی ئێوە دەبەم .. گوڵی سەدان ڕەنگ سەدان جۆر .. زەردو سپی و سوورو مۆر .. جۆرەها بۆن .. کێ دەزانێ .. کێ ئاگای لێیە ؟ دەشێ گوڵی سەوزیشتان هەبێ .. دەڵێن .. من بیستوومە : ئێوە گوڵی ڕەشیش پەیدا دەکەن .. هەر بۆ شانازی لە هەندەرانەوە دەیکڕن .. ئەگەرچی حەز لە ڕەنگی ڕەشیش ناکەن .. لای ئێوە ڕەنگێکی تاڵ و ناشیرین و دزێوە .. ئێوەی هەمیشە دەم بە پێکەنین .. شێتی قاقاو تریقە .. سەماو سوڕدان .. دزی و پێك هەڵدان .. پرسەو نسکۆنەدیو .. چاوچنۆك و زگ تێرو ناوگەڵ برسی .. ئێوە کەی حەز لە گوڵی ڕەش دەکەن ؟.. نا قەت حەزی لێ ناکەن .. ئەگەر دەزانی هەیە .. بەرلەوەی بۆیەکجاری بتۆرێی .. بەجێم بهێڵی .. بە یادی ئەم جودایی‌یەو ملیۆنەها خەم و مەینەتی و حەسرەت و حەژمەت و ماڵئاوایی دیکە : قەڵەمی گوڵەباخێکی ڕەشی قەترانیم بۆ پەیدا بکە .. من شێتی گوڵی ڕەشم .. هەروەك چۆن شێتی کراس وکەوای خمداری بێوەژنە کۆسکەوتووەکانم .. ئەوسا لەنێو حەوشە چکۆلانەکەو لەسەربان و ناو ماڵیشەوە دەیچێنم .. چەندەها قەڵەمی گوڵەباخێکی ڕەشم بۆ بخوازە .. بە فرمێسك و خوێنی خۆم ئاویان دەدەم .. بۆم بکرێ لەسەر دڵیشم دەیڕوێنم .. تا وای لێ دێ ناڵەکەمان هەمووی دەکەوێتە ژێر تەباری زۆری گوڵی ڕەش .. وەك گیاکەلەش لق و پۆپ و گەڵاو گوڵ و ڕەگ و ڕیشەی بە هەموو لایەکدا بڵاو دەبێتەوە .. لە هەموو لایەکەوە هەر گوڵی ڕەشەو دەپشکوێ .. ئەوساش هەموو گەڕەك وەئاگا دێ .. دەکەونە خۆیان .. دەترسن .. دەبێ بە هەراو قیامەت و ژاوەژاو .. هەموو شتێ دەئاڵۆزکێ .. دەشڵەژێن کە دەبینن هەموو ماڵەکەمان .. سەرتاپای خانووەکەمان کەوتۆتە ژێر باری قورسی گوڵی ڕەش .. خەم پیاوە دەوڵەمەندەکانی گەڕەك دادەگرێ .. دەست بەیەك دادەن .. بە هەناسەسواری سەر لە بن گوێی یەکدی دەنێن .. دەکەونە پیلان و کوودەتا .. ئارەقەی پەستی دەردەدەن .. مەترسی ئەو گوڵەباخە ڕەشانە دەیانتۆقێنێ .. هەموو تێکڕا کۆ دەبنەوە .. بە ماڵ ژن و منداڵەوە .. ژن و پیاوتان هێرش دێننە سەرمان .. کرێکاری برسی

وەك من و پیرەباوكم بەكرێ دەگرن .. لەشكرێ پێكەوە دەنێن ..
هەمووتان بە خاكەنازو بێڵو پێمەرەوە دێنە سەرمان .. تا ئەو
گوڵەباخە شوومە لە بنەوە .. لە ڕەگەوە هەڵتەكێنن : تەباری
گوڵی ڕەش .. كە ڕەنگی نەگبەتی و شووم و نسكۆ بۆ ئەو گەڕەكە
دەهێنێ .. هیچ كەسێكیان نامان ناسێتەوە .. دەكەونە
گیانمان .. بە خاكەنازو پێمەرەكانیان دەمارو گۆشتمان
دەڕننەوە .. بە بێڵی دەستیان كەللەسەرمان وەك بەردی نەرم
دەبێ بە دوو لەتەوە .. دەمان هەنجنن .. مەگەر تۆ
بمناسیتەوە .. تەنهاتۆ ! مەگەر تۆ بگری بزریكێنی .. هاوار
بكەیت و بپارێیتەوە .. لەو پیاوە ماقوڵانە .. لە دایك و باوكت ..
دەرودراوسێ .. لە قۆنتەراتچی و بازرگانە قەبەو دڵڕەقەكان
بپارێیتەوە .. مەگەر تۆ بەدەم گریانەوە پێیان بڵێیت : -

- ئەوە ماڵی مام سمایلە .. گوڵەباخێكی ڕەش و شووم نی یە ! كەس گوێت لێ ناگرێ .. دەكەویتە شین و ڕۆڕۆ .. پێیان دەڵێی :
- بێڵ و خاكەناز فڕێدەن .. ئاخر لەژێر تەباری گوڵە ڕەشەكان (حەمە) ی خۆشەویستم نوستووە ..

كەس گوێت لێ ناگرێ .. دەستیان دەگری و لێیان دەپارێیتەوە :

- هەڵیمەكەنن .. بەشێنەیی ڕەگی گوڵەباخەكە بپچڕێنن .. ئەبا (حەمە) ی من وەك گوڵەكان هەڵبوەرێ ! كەس گوێت لێ ناگرێ ..

مەگەر تۆ نەهێڵی .. ئەگینا دوای هەڵتەكاندن بە دڕك و
گەڵاو گوڵ و ڕەگەوە دەمان سووتێنن .. ئەوسا دەبین بە
خۆڵەمێش .. بۆ یەك دوو ڕۆژیش خۆڵی ئێسك و گۆشتمان بەسەر
كۆشكە پاك و خاوێنەكانتانا دەبارێ .. هێدی هێدی دەبارێ ..
بەسەر سەرو پرچ و برژانگ و برۆو دەست و سەربان و پەنجەرەو
بالكۆنەكانتانا دەبارێین .. نەرم نەرم دەبارێین .. ئێوەش ناچار
بە گەسك و سوندەی ئاو ڕامان دەماڵن .. دەمان شۆن .. لەگەڵ
ئاوەڕۆی حەوشەكانتان دەڕژێینە نێو زێرابەكان .. ئێوە خوێن و
خۆڵەمێشی گۆشت و ئێسقانی ئێمەمانان دەخەنە زێرابەكانتان ..
یەك - دوو ڕۆژیش سەر شانەكانتان لەو تۆزە پیسە
دەتەكێنن .. تۆزی لەشمان .. لەشی سووتاومان .. ئیتر چیتر
ئەو دوومەڵە پیسە لەو رووە جوان وخاوێنە نامێنێ .. ئیتر ئەو
دوومەڵە .. ئێمەی دوومەڵ دەتەقین و بە دەستێ ئاوو سابوون
خۆتان لە ئێمە پاك دەكەنەوە .. هەمیشە دەبێ وا بێ .. لای
ئێوە یان دوومەڵین یا ئەوەتا گوڵەباخی ڕەشی نەگبەتین .. ئاخۆ
دەبێ بۆ وا بێ ؟ .. دە بیخوازە .. قەڵەمی گوڵەباخێكی ڕەشی
قەترانیم بۆ بدۆزەرەوە .. ئاخر من شێتی گوڵی ڕەشم .. چاوە
ڕەشەكانت فێریان كردم هەموو شتێكی ڕەشم خۆش بوێ ..
هەتا چارەنووسی ڕەشیشم ....

دە پەنجەرەكە بكەرەوە .. با وەك سەردەمی منداڵی
نەیەمە سەر دیوارە نزمەكەتان .. بیرتە ئەوساش هەر لەسەر
دیوارەكەوە سەیری گوڵی نێو باخچەكەم دەكرد .. حەزم دەكرد
لەسەر فەرشی چیمەنە سەوزەكە گەوز بدەم و وەك كاریلە قاچ و
قولم .. سەرو ملم بە شەونمی باریوی سەر گیای پڕی
بشۆمەوە .. ئەوساش باوك و دایكت تێیان دەخوڕیم .. دەریان
دەكردم .. نیوەڕۆیانیش : بۆنی چێشت و گۆشتی برژاوی ئێوەو
ماڵەكانی دیكە ئێمەی كاس و گێژ دەكرد .. هەموو بەیەكەوە
لیكمان دەكرد .. بەمۆنی لە دەوری قاپی پیرخەنیلەو یان
لەگەنی نیسكێنە كۆ دەبووینەوە .. زۆرجار من و براو خوشكە
وردیلەكانم بەیەكەوە بۆ گۆشتی برژاو دەگریاین .. تامەزرۆ
بووین .. مانگەومانگ دەمانەدی .. ئێستا ئەوسا نی یە ..
ئەمێستاكە شەرم دامدەگرێ كە بۆ گۆشتی برژاوی ئێوەو
ئەوانی دیكە گریاوم .. سەركز ناكەم .. ئامادەم گۆشتی نێو
هەناوی خۆم بخۆم .. ئای كە گێلی تۆ ..! نازانی برسیەتی چ
ماموستایەكی گەورەو دڵڕەقە ..! بمبورە .. ئەوسا منداڵ
بووم .. نەمدەزانی گریان بۆ گۆشت و باخچەی پڕ گوڵی
خواپێداوەكان شتێكی نەنگە .. شەرمێكی گران و قورسە ..
جارجارەش بەدزییەوە كوتەگۆشتێكت دەدامێ .. منیش
بەشەرمەوە لێم وەردەگرتی .. پاشان وەك سەگی برسی لەژێر
ددانەكانما دەمجویی .. ئای لەو تامە خۆش و پڕشەرم و دوورو
لەیادنەچووەی جاری جاران .. ئێستاكە ئەوسا نی یە .. تەنها
خۆزگەیەكم كرانەوەی پەنجەرەی ژوورەكەتە .. هەڵبرینی ئەو
پەردە تەنكەیە .. دە ئەو پەردەیە لادە .. ساماڵی ئاسمانێكی
شین و بێگەردی لێگرتووم .. من ساماڵی خۆم لە ژوورەكەی
تۆدا بەدی دەكەم .. من چی لە ساماڵی خوا بكەم ؟! تۆ ڕۆژی
سەدجار هەوای ژوورەكەت دەگۆڕی .. لە میكروب و بەكتریا
دەترسایت .. هەفتەیەكە بۆ داتخستووە ؟ چیم كردووە ؟ چی

بووە ؟ بۆ وا بەبێدەنگی تۆراوی ؟ یان هەڵیان‌وەشاندووی ؟
ئای لەو کافر بابانە .. چۆن دەهێڵن .. چۆن دێڵن جـۆگەلەی
قوراوی تێکەڵ بە رووباری ئەوان بێ ؟ دەشێ چەند چینێکی‌تر
بخەنە سەر دیوارە نـزمەکـەتان .. نـەبا نیگـاکانم وەك پـۆلە
چۆلەکەیەکی شەرکەر بپەڕێتەوە سەربان‌و نێو حەوشەی پـڕ
گوڵی رەنگاو رەنگتان .. مەترسن ئەوسـا نی‌یە .. منـاڵە هارو
چەتوونەکەی جاران نیم .. کت‌وپڕ خۆم ناکەم بەنێو حەوش‌و
ژوورە رازاوەکانتان . ئەوسا نی‌یە بوخچەو جانتای خانمەکانم
بێ هەڵبگرن تا بتوانم گوڵی بدزم‌و دەست لە کراسە تەنکەکەی تۆ
بدەم .. هەنـووکە بـەم سمێڵ‌و ردێنـەوە ناتـوانم بێمە سـەر
دیوارەکانتان‌و سەیری گوڵ‌و چیمەن‌و هێلانەی نێو درەختەکان
بکەم .. چیتر وەك سـەردەمی منداڵی نـاوێرم بـەحەسـرەتەوە
دەست لە کراسە تەنك‌و گوڵ‌گوڵییەکەت بدەم .. ئێستاش کـە
دەچمە پێشانگاو کۆگاکان‌و دەست لە کراسێکی تەنکی کچانە
دەدەم : هەمان ختووکەو موچرکی منداڵی بەنێـو دەمارەکـانما
مێروولە دەکا .. ناکرێ وەك جاران کە تاو نا تاو لە قوژبنی نێوان
خانووەکان‌و پەناو سەرسوچی کۆڵان دەمگرتی‌و ماچی کورت
کورتم لەو کوڵە ئاڵەت دەدزی .. تۆش وەك ماسی .. ماسی‌یەکی
چکۆلانە خۆت لەژێر دەستم دەخزاند .. خۆزگە خولی سەعاتو
کات‌و زەمانە دەگەڕایەوە دوا .. بۆ گەورە بووین؟ گەورە بووین
تا بترسین .. تا پڕ شەرم‌و شکان بین .. خـۆزگە قـەت گەورە
نەدەبووم .. تا وەك سەردەمی منداڵی قەڵس‌و بێزارتان بکەم ..
بیرتە چەندە بێ هاورێ‌و تەنیا بووم .. لە حەژمەتانا دەچوومە
قەسابخانەکەی دەرەوەی شار .. لەشکرێکی گەورەی سەگ‌و
پشیلەم دەخستـە دوای خۆم .. دەمهێنـانەوە نێـو گەڕەك ..
سـەگ‌و پشیلەکان شێتی گـەڕەکێکی وا چـەور بـوون ..
بـەئامـان‌و زەمان نـەدەروێشتن .. هەستم دەکـرد هـەمـوو
هـاورێی دلسـۆزی منن .. کلکیـان بـادەداو سـوپـاسیـان
دەکردم .. ئێوەش هەموو سەغڵەت دەبوون .. جارێکیان ژن‌و
پیاوی خڕو قەڵەو هاتنە لای دایکم .. من لە ترسـانا چـوومە
سەربانەکەو لەنێو کۆلیتی مریشکەکان خۆم شاردەوە .. گوێم لێ
بوو ایکی پڕ سۆزو میهرەبانیم پێی وتن :

ـ تو خوا وازی لێبێنن .. (حەمە) کەی من سەگ‌و
پشیلەی زۆر خۆش دەوێ ..

ئەوانیش وتیان :

ـ پیرەژن .. ئێرە قەسابخانە نی‌یـە .. کوڕەکـەت شێتی
کردین ..

دایکم وەڵامی هیچیانی نەدایەوە .

هەموویان بەدەم پرتەو بۆڵەوە چوونە دەرێ .. ئەو ماقوڵانـە
گەلێ جنێویان‌دا .. هەرگیز دوا ڕستەی باوکتم لە بیرناچێتەوە :

ـ بـەلەدی‌یـە نـایـەت ئـەم قـەرەجـانـە بخـاتـە لۆری
زبڵەکەوە !!!؟؟.......

وازم نەهێنا .. پتر شەیدای سەگ‌و پشیلەو جاشولەکان بووم ..
وەك دوو دۆستی گیـانی‌بەگیـانی دەستم لە ملی هـەموویـان
دەکرد .. ئێوە هەمووتان پتر شێتگـیر بوون .. پـەست‌و زویر
بوون .. لەسەر زبڵخانە مەزنەکانتان دەلەوەڕاین .....

هێرۆگیان : بەدەست من نەبـوو .. لە تەنیـایی خۆمـا
سەگی قەسابخانەو بن پردەکانی شارم خۆش‌دەویست !
چی دیم بۆ دەکرا ..؟

دە دەرکەوە .. پەنجـەرەکە بکـەرەوە .. زەردەپەڕێکی
شیرینەو هەتاوی زێڕین هەموو شاری گرتۆتە باوەش .. دەمەو
ئێوارەیەو هەموو شتێ سۆزو خەمی لێ دەتکێ .. لەوە دەچێ
خـەڵکێکی زۆر ئاسـوودە بن .. زۆریش غەمگـین .. وەرە ناو
بالکۆنەکەو .. بۆدوا جار ناوی ئەو گوڵە مۆرەم پێبڵێ‌و ئەوسا بۆ
یەکجاری پەنجەرەکەت لە رووما داخە .. هەفتەیەکە ئاویـان
نادەی .. ئەوەتانێ وەك دڵەکەی من تینوویانە .. وەك لێوەکانم
شاپەلکیان وشکن .. کێ گوڵ دەمـرێنێ ؟ کێ لە دەستی دێ
گوڵ بە مەرگێکی ناوەخت‌و کت‌وپڕ بسپێرێ ؟ هێرۆگیان قەت وا
نەبوویت.. خۆزیا مێـژووی تاڵی سـەردەمی منداڵی خـۆمم بیر
دەچۆوە .. ئەوسـا تۆش‌دەبـووی بە بـادێکی مردووی ئـەو
سەردەمەو هیچی‌تر .. بیرتە ئەو جارەی لێم پرسیت :

« ـ لەوە ناچێ ئەم گوڵانە سیس بن .. ئاخۆ هەر وا
دەبن ؟

ـ حەمە .. کەی تۆ لە دڵما مردیت .. ئـەوسا ئـەم
گوڵانەش بە مەرگ دەسپێرم ..

کەواتە من ئێستاکە مردووم .. ئەوەتـانێ گوڵەکـانیش هێدی
هێدی .. گەڵا گەڵا .. ڕیشاڵ ڕیشاڵ وا دەمرن .. ئای لەو رەمزە
تاڵەی تۆ خوڵقاندت ..

ئـاشت مەبـەرەوە .. مەیـەرەوە .. سەیـرم مـەکـە ..

**پولی ڤاینیل کلوراید (pvc) poly (Vinyl chloride)**

پلاستیکیکی زۆر بەسودو بەناوبانگە . بەکورتی پیی‌دەڵین (pvc) . لەمادەی ڤاینیل کلوراید $CH_2$ CHCl دروست دەکرێت بەگویرەی کیشەی کیمیایی خوارەوە . =

پولی (ڤاینیل کلوراید)




(pvc) لە هەمو جورە پلاستیکەکانی تر ناسراوترە وە گەلێك شتی لێ دروست دەکرێت . بۆ وێنە : تاقمی ئەسکەمیلو مێزو قەنەفە ، چەرمی دەستکرد (چەرمی پیشەسازی[**]) لولەی ئاو ، موشەمای سەر مێزو جانتاو پشتوێن و پێڵاوی ژن و پیاو ، هەیکەلی رادیۆ تەلفزیون ، و هەیکەلی سەلاجەو فریزەرو تەباخو سۆبە ، فەرشو بەرگی کتێبو چوارچوبەی وێنەو زور شتی تر زوربەیان لەپلاستیکی (pvc) ئامادە دەکرێت .

شایانی باسە (pvc) پەتی زور رەقە . کیشەی مولیکیولەکانی لە 30000 — 80000 دەبێت . بەشیوەیەکی پەتی سودی ئەم پلاستیکە زور کەمە لەبەر رەقی . بەلام لەکارگەکاندا (pvc) تێکەڵ دەکەن لەگەڵ هەندێك لەیەك هاتوی کیمیایی تایبەتی وەکو ئیستەری فثالات phthalate esters وەیا مادەی فوسفات phosphate وەیا هەندێك لەرونی ئوکسید کراو . Epoxidized oil ئەم جورە مادانە پێیان دەڵێن « پلاستیسایزەر[**] plasticizer» وە تێکەڵکردنی لەگەل پلاستیکەکە خۆماڵی نەرمیو لاستیکی ئەدات بە پلاستیکەکە . بەلام (pvc) عەیبێکی هەیە ئەوەیش ئەوەیە کەبەگەرما خۆی ناگرێ‌و بەرەبەرە لەپلەی گەرمی 80 °م وە یا بەتیشکی خۆر شی دەبێتەوەو غازی کلوریدی هایدروجین HCl بەرەلا دەبێت . کێشەی کیمیایی خوارەوە ئەمکارە نیشان ئەدات :



ئەم کارە کیمیاییەی سەرەوە جگە لەوەی پلاستیکەکە دەرزینی و بی‌هێزی دەکات بەلکو غازی HCl کە دەردەچێت زیانی تەندروستیو ئابوری زیادترە . بۆ بەربەستی ئەم جورە شی بونەوەی (pvc) گەلێك جار هەندێك لەئۆکسیدی کانزادەکان وەیا خویی ئۆرگانیك . Organic Salt لەگەڵ پلاستیکەکە تێکەڵ دەکرێت . بەم جۆرە کارە کیمیاویەکەی سەرەوە بەربەست دەکرێت وەچەنیەتی غازی HCl کەم دەبێتەوە .

سالی (3.5) بلیون[**] کیلوغرام لەمادەی (pvc) دروست دەکرێت لە ئەمەریکا جگە لەولاتەکانی ئەوروپاو روسیاو ژاپون .

بێجگە لە (pvc) گەلێك جۆرە پلاستیکی ترهەیە لە بازاردا وەکو پلاستیکی پولی ئەثیلین poly ethylene وە پلاستیکی « پولی ستایرین » و پولی (ئەکریلو نایتریل) poly (acrylonitrile) وە پولی ئەکریلاتی مثیل poly (methyl acrylate) وە پولی (مثیل میثا اکریلات) poly (methyl metha acrylate) .. هتد . هەمو ئەم پولەرانە وەك (pvc) ئامادە دەکرێن بەگویرەی کیشە کیمیاییەکانی خوارەوە : —




بێ‌گومان پلاستیك گەلیك جۆرە چەشنی تری‌هەیە . لەم وتارە کورتەدا جێگا نابێتەوە هەمویان بەدرێژی باس‌بکەین . ئومیدەوارین کەلە فرسەتیکی تردا باسیان بکەین .

لەکوتاییدا بەپیویستی ئەزانم کەناوی دو جۆرە پلاستیکی تر بهێنم کەزۆرنایابن‌و بەنرخن . ئەم پلاستیکانە ئەمانەن : —



1 — پولی یوریثان Poly urethane




2 — پولی میلامین
(پولی ئەمید)

## پەراویزو سەرچاوەکان :

(1) دوکتو ذمنون پیریادی ، میژوی لاستیك وپیکهاتنی کیمیایی ، گوفاري کاروان زماره 15 ، لاپەره 64 ، سالی 1983 .

(2) پولیمەر : Polymer ـ جوره پیك هاتویەکی کیمیایی تایبەتی‌یە . بروانە پەراویز زماره (1) لەسەرەوه .

(3) مەبەست لەرەقی ئەومیە وەك شوشە رەق دەبیت .

(4) H . Mark , (polymer chemistry in 100 years) Chemical and Engineering News , Page 176 , April 6 ,1976 .

(5) ، براءة اختراع ، = patent = مافی دۆزینەوه

(6) نایتروسیللوز ئەم فورمیولای کیمیاییەی خوارەوەی هەیە :




(7) نزیکەبللوری = شبەبللوری = Semicrystalline

(8) بی‌بللوری = غیربلوری = Amorphous

(9) باکلایت Bakelite = بریك لە چەشنەکانی پلاستیك ئەگریتەوه ، هەندیکیان پلاستیکی گەرما بەرگرە وەکو پلاستیکی فینول ـ فورم الدیهاید Phenol — For-maldeh yde ومیا یوریا ـ فورم الدیهاید . هەروەها ئەم ناوه ناویکي بازرگانیە (اسم تجاري) وه هەندیك لەپلاستیکی گەرما بەرنەگریش دەگریتەوه وەکو پولی ستایرین Polystyrene وپلاستیکی تر ..

(10) لیو هـ . باکلاند Leo H . Backland : کیمیا زانی ئەمەریکایی لەسالی 1863 لەبەلجیکا لەدایك بوه . لەسالی 1944 وەفاتی کردوه . لەتەمەنی (26) سالی کوچی کردوه بوئەمەریکا . دوکتور باکلاند لەکیمیای پیشەسازی لی‌کولیومتەوه . پلاستیکی فینول فورم‌الدیهایدی بویەکەم جار دروست‌کرد . هەمیشە کاغەزی فوتوغرافی دروست‌کرد , Velox Photographic Paper لەسالی 1924 بۆ بەسەروکی ئەنجومەنی کیمیا زانەکانی ئەمریکا .

(11) شیلاك Schellac : مادەیەکی زور لینجە لەلایەن جۆره مەگەزێکی تایبەتی دروست دەبێت لەهیندستان . ئەم مەگەزانە مادەی شیلاك دەردەکەن لەکیانیان‌و بەهوی لینجی مادەکە قاچی مەگەزەکە دەنوسیتە چلەدارەکەوه ومخوی شوٚر دەکاتە خوارەوەو استراحەت دەکات . خەلکی هیندستان شارەزای مادە لینجەکە بوبون (شیلاك) وه دەیانکرانەوه لەدارەکەو پوختەیان دەکردو بەکاریان دەهینا بودروست کردنی ئەشیای ناو مال لەجیاتی پلاستیك .

(12) یۆنیەن کارباید Union Carbide ـ یەکیکە لەکومپانیە گەورەکانی ئەمەریکا . بەتایبەتی شتومەکی بازرگانی‌و دەرمان دروست دەکات .

(13) شلاوی کیمیایی Chemical solvent = مذیب کیمیائي .

(14) تیترافلورو ئ ئیلین Tetrafluoro ethylene = مادەیەکی غازە فورمیولای کیمیایی ئەمەیە = $CF_2 - CF_2$

(15) لوٚله = اسطوانه = Cylinder

(16) بەفری‌وشك = Dry ice = بریتیە لە دوهەم ئوکسیدی کاربون بەپلەپەستوو سەردکردن شیوەیەکی رەق وەردەگریت وەك بەفر ئەم $co_2$ رەقە بەکار دەهینریت بو جی‌بەجی کردنی ئەوتاقی کردنەوه زانستیانەی کەپلەی گەرمی زوٚر نزمی پی‌ویستە وەکو پلەی ـ 70 °م بوٚ وینە .

(17) Jack Rabok ئیش کەریکی تەکنیکی بو کاری‌دەکرد لە لابوٚرەکەی دوکتور پلانکیت Plankat .

(18) ئوکسجین $O_2$ = لەکیمیادا ئوکسجین دەژمیریت بە ، رەگی بەرەلا ، Free Radical . واتە بوسان ئەمش کە فورمیلای ئوکسجین بەم جورە بنوسین $O\uparrow - O\uparrow$ . رەگی بەرەلا : ئەومادانەیە کە لەئەتومی مولیکیولەکانیاندا ئەلکترونی تەنها (تاق) هەبی . وەك ئەتومي هایدروجین $H^{\circ}$ ومیا ئەتومي کلور $Cl^{\circ}$ یا کومەلی مەثیل $CH_3^{\circ}$ و کوٚمەلی ئەثیل $C_2H_5^{\circ}$ . پولیمەر پیك هینان پیویستی بە ئەختیك لە رەگی بەرەلا هەیە بوٚ جی‌بەجی کردن .

(19) پەتی = نقي = Pure

(20) دوزینەر = مخترع Inventor

(21) بومبای‌ئەتومی = القنبله الذریه = Atomic bomb

(22) کاسکیت = واشەریکی گەورەیە لەنەعین ماکینەی ئوتومەبیلدا .

(23) چەرمی پیشەسازی = چەرمی دەست کرد = جلد صناعي = A.*tificial leather

(24) پلاستیسایزەر ـ plasticizer : الملدنات = ئەومادە کیمیاییانەیە کەتیکەل دەکرین لەگەل پلاستیك بو ئەوەی خومالی پلاستیکی نەرمو لاستیکی بدات بەمادەکە .

(25) بلیون Billion = هەزار ملیون (1000 million)

# تەندروستی منداڵ



د . سەردار عبدالرحمن امين
نەخۆشخانەی منداڵان لە هەولێر

**پێشەکی :**
خۆشکو برایانی خوێندەواری بەڕێز ، دایکانءباوکان نامەوێ بە پێشەکیەکی کلاسیکی دەست بە وتارەکەم یان باسەکەم بکەم ، هەرچەندە باسەکەم لەبابەت زانیاریەو ویژەیی نیە کە ئێوەی بەڕێز تاکو ئێستا زۆرکەم لە گۆڤارە کوردیەکاندا باسی زانستیتان خوێندوتەوە ، بەتایبەتی لەمەڕ زانستی پزیشکیەوە ، وە بەتایبەتی زانستی تەندروستی منداڵو منداڵ بەخێوکردن ، بەڵکو دەمەوێت بە پێشەکیەکی واقیعی دەستی پێ بکەم ، بۆ ئەوەی خوێنەرانی بەڕێز سوودێکی چاکی لێوەربگرن و لەهەمان کاتیشدا ببێت بە ڕێ نیشاندەرێك بۆ ئەو دایکانەی کە هەلومەرجی وایان بۆ نەڕەخساوە فێری خوێندەواری بنو بەوردی و ڕاستەوخۆ سوود لە زانستو زانیاری وەربگرن ، بەوهیوایەی توانیبێتم شتێکی بەکەڵك پێشکەش بەو دایکە نەخوێندەوارە ئازیزانە بکەم .

هەڵبەتە هەموو دەزانین کە ساوای ئیمڕۆ پیاوی پاشەڕۆژە ، بەلام ئەوەی جێگای داخە بەشێکی زۆرکەم دەرك بەوە دەکەن کە ئەو نەخۆشیو ئێشو ئازارەی لە ئەنجامی پەروەردەکردنی منداڵەوە بەرلەوەی ساڵی یەکەمی تەمەنی تەواو بکات ، کار دەکاتە سەر تێکرای ژیانی داهاتوی منداڵ . واتە منداڵ لە تەمەنی ساوایەتی گەر نەخۆش بێت وە یاخود بە باشی بەخێو نەکرێت بەدووری مەزانە لەگەورەییدا ئەندامێکی زۆر باشو زیرەکی لێ نایەتە دی ، لێرەدا ئێمە دایکان ناترسێنین بە نەخۆشبونی منداڵ بۆ جارێك یان چەند جارێك ، بەڵکو ئاگاداریان دەکەینەوە کە بایەخ بدەن بە منداڵەکانیان وە نەهێڵن نەخۆش بکەونو بێ سڵکردنەوە تا دەتوانن لە شیری خۆیان دووریان نەکەنەوەو پەنا نەبەنە بەر شیری قوتوکە ئیمڕۆوەکو ڕواڵەتێکی ئاشکراو دیار پەرەی سەندووەو ڕۆژ لە دوای ڕۆژ تەشەنە دەکات .

**چەند گلەییەكو سەرزەنشتێکی دایکانی ئیمڕۆ :**

ئێمەی پزیشکی منداڵان ڕۆژانەیە گلەیی لە دایکانی ئیمڕۆ بەتایبەتی دایکە خوێندەوارەکان نەکەین ، ئەوەتا لە زۆربەی کۆڕەکانماندا باسی ئەمجۆرە دایکانە دەکەین کە لە بواری پەروەردەکردنو خاوێنکردنەوەی منداڵەکانیان تابڵێی سستو کەمتەرخەمن .

تەنانەت پزیشکێکی ئافرەت کە خۆیشی دایکە زیاتر لەجارێك پەرۆشی خۆی دەربڕیوە کە زمانی کوردی نازانی ئەگەرنا وەك خۆی دەیلێ « من دەمزانی چۆن کوڵی دڵی خۆمم بۆ ئەم چەشنە دایکانە دادەڕژاند .

بەداخەوە دایکانی ئەم سەردەمە چ خوێندەوار ، چ نەخوێندەوار ئەم زانیاریانەی کە مەبەستەو دەبێ هەولی ئەوەبدات سوودی لێ وەربگریو بەچاکی لێیەوە فێربێت بۆ ئەوەی لە دواڕۆژدا بەکاری بهێنێت بۆ پەروەردەکردنی منداڵەکەی ، هەرچەندە ئەم جۆرە دایکانەش زۆر کەمو دەگمەنن .

بۆ نمونە شیری دایك ، لەراستی دەتوانین بڵێین زێڕێکە لەکڕین نایەت کەچی زۆر بەهاسانی خراوەتە پشت گوێ ، هەروەها زۆرلەو خوشکانەی کە شوودەکەن وە دەگەنە قۆناغی منداڵ بەسك کەوتن هەرگیز بیرلەوە ناکەنەوە کە روولە دایکیان یا لە خەسووەکانیان بنێن بۆ ئەوەی هەندێ مەرجی تایبەتی منداڵ بەخێوکردن و پەروەردەکردنی وە چۆنیەتی شیر پێدانی منداڵی ساوایان بۆ ڕوون بکەنەوە و تێیان بگەیەنن ، چونکو هەرچۆنێ بێت ئەوان زیاتر دونیا دیدەنو شارەزان لەم بوارەدا کەچی بەپێچەوانە دەکەوێتەوە کە ئەویش هەر لەزووەوە ئەو جۆرە دایکانە خەمی ئەوەیانە چەند قوتو شیرێكو چەند شوشەیەکی شیر پێدان بۆ منداڵەکانیان ئامادە بکەن بۆ ئەوەی هەر لەزووەوە بەشیری قوتو منداڵەکانیان ڕابهێنن جا باش بێت

یان خراپ ئەمەیان باسێکی ترە . جگە لەمەیش بەدەگمەن هەڵدەکەوێ کە کچێك هەر لەزووەوە ئەم جۆرە کردارانە لەدایکی خۆی فێری بوو بێت کە ئەویش وەکو گوتمان پەروەردەکردن و چۆنیەتی شیرپێدانی مندالی ساوایە .

خوێنەری ئازیز ئەمانەی کە پەنجەمان بۆیان ڕاکێشا تەنها چەند نموونەیەك بوون و بەس ، هەرچەند نموونەی تریش هەر لەم بابەتەوە زۆر هەن بەلام لەکات و شوێنی خۆیدا جارێکی تر دەگەڕێمەوە سەریان و لێی دەدوێم بۆ ئەوەی وردتر لێیانی بکۆڵینەوەو ئەنجامی باسەکەیشمان بەسوودتر بێت .

لەم چەند ساڵانەی دواییدا سەرنجێکی وردی بەشێکی زۆری ڕۆژنامەو گۆڤارە کوردیەکانم دا بەڵکو چەند دێڕێك یا چەند ئامۆژگاریەکم وەبەرچاو بکەوێ کە لەلایەن پزیشکەکان وەیا لە لایەن پسپۆرەکانەوە نوسرابێتەوە ، بەلام بەداخەوە ئاواتەکەم نەهاتە دی ، جا نازانم هۆی بەرچاو نەکەوتنیانم ئەوەبێ کەهەر نەنوسرابنەوە ، یا نوسراونەتەوەو من نەمدیون ، ئیتر ئەوە هانی دام کە منیش وەکو کوردزبانێك لایەنێك لەم بوارە بگرمە بەرو بەپێی توانا ئەسپی خۆمی تیا تاو بدەم ، بە تایبەتی دوای ئەوەی زانیم کە گۆڤاری کاروان بواری ئەوەم دەدات لە ڕێگەی لاپەرەبێ گەردەکانی یەوە شتێ پێشکەش بە خوێنەری کورد بکەم و بەڵێنی ئەوەش دەدەم کە ئەوەی بۆم بکرێ لە بابەت تەندروستی منداڵ و بەخێوکردن و پەروەردە کردنیەوە بیکەم بۆ ئەوەی منیش لەم ڕێگەیەوە بتوانم بەشداری بکەم لە کاروانی بەرەوپێش بردنی مرۆڤایەتیدا کە مندالان ئیمڕۆ باشترین پێشەنگێن ، وەبۆ ئەوەی دایکانی خۆشەویست لەم سەردەمەدا سوودی لێ وەربگرن و مندالە بچکۆلەکانی ئیمڕۆ پیاوە مەزنەکانی دواڕۆژی بێ پەروەردە بکەن و ڕاسترین و چاکترین ڕێگەی پەروەردە هەڵبژێرن بۆ ئەم مەبەستەو بۆ ئەوەی نەتەوەو وولات سودیان لێ ببینێ و نەبن بەبار بەسەر باوکو دایك و وولاتدا لە ئەنجامی نەخۆشی و نەزانینی بەخێوکردندا بۆ ئەم مەبەستە لێرەدا نموونەیەکی زۆر جوانتان بۆ باس دەکەم کە ئەویش نەخۆشی ئیفلیجی مندالانە « شلل الاطفال Poliomyelitis » کە تێدا منداڵ لەپێ دەکەوێت کە ئێمە ئیمڕۆ زۆر بە هاسانی دەتوانین بەرهەڵستی ئەم نەخۆشیە ترسناکە بکەین هەر لە تەمەنی منالیدا ئەویش بەهۆی کوتانی مندالەکە بە « 3 — 4 » دڵۆپە لە « لوقاحی » دژی نەخۆشی



ئیفلیجی مندالان کە بەسێ تا چوار جاری هاتوچۆی نەخۆشخانەو یا مەڵبەندەکانی بەرگری لە نەخۆشی کە لەسەرتا سەری وولاتەکەماندا بلاو بونەتەوە بێ پارەیە واتە بە بەلاش مندالەکە دەکوترێ و چارەسەری دەکرێ ، لەهەمان کاتدا بەپێی یاسا ئێستا کوتانی منداڵ بەزۆرە ، واتە ئەم مندالەی کە پرۆگرامی کوتانی تەواو نەبێت دەفتەری نفوسی بۆ نادرێت و ناونووس ناکرێت هەروەها مندالەکە گەر نەکوتراو دووچاری ئەم نەخۆشیە هات پەشیمانی داد نادات وە منالەکەیش لەپێ دەکەوێت هەرکە گەورەش بوو دەبێ هەر خزمەت بکرێت ، ئەمە جگە لەو ئەرك و ئازارەی کە لەکاتی چارەسەرکردنی دەکەوێتە ئەستۆی دایك و باوك و نەخۆشخانەکانیش پێیەوە هیلاك دەبن .

خوێنەرانی ئازیز ؛ دایك و باوکانی بەرێز .. ئەم پێشەکیی یە کورتەی باسم کرد وەك بەرکولێك وابوو ئێستا بە وردی دەچمە نێو باسەکەو هەندێ لەو لایەنانە ڕوون دەکەمەوە کە بەلای زۆربەتان بزرو نادیارن ، بۆ زیادە سوود وەرگرتنیش من ئامادەیی خۆم نیشان دەدەم و دەڵێم هەموو کاتێك حازرم وەلامی هەموو پرسیارێکی ئێوەی ئازیز بدەمەوەو ئەو ئێشوو ئازارەی مندالەکانتان دووچاری دەبن بەپێی توانا هاوکاریتان لەگەڵدا دەکەم بۆ چارەسەرکردنی و هەموو لایەك بۆتان هەیە لەم بوارەدا پەیوەندیم پێوە بکەن ، بۆ ئەوەی مندالە ئازیزەکانمان هەردەم لە ژیانێکی خۆشدا بژین .. ئێستاش دیمە سەر دەقی باسەکەم کە لایەنێکی گرینگی خواردنی منداڵ دەگرێتەوە کە ئەویش « شیرە » ، شیری دایك یا شیری دروستکراو »

## باسی یەکەم

## شیری دایك

منداڵی تازە لەدایك بوو پاش سەفەری نۆمانگە لەناوزگی دایك کە دێتە سەر دونیاوە ماندووە بە تایبەتی چەند کات ژمێری کە دایك خەریکی منداڵبوونە ، بە تایبەتی ئەگەر هاتوو دایك بۆ یەکەم جار منداڵی ببێت ، لەهەمان کاتدا مندالەکە برسیەو

پێویستی بە خۆراك هەیە وەكو هەر گیانلەبەرێكی دیكەی سەر ڕووی زەمین ..

لەشەش كاتژمێری یەكەمدا دایك شیری نیەو ئەگەر هەیشی بێت زۆر كەمەو هەروەها هێزی مژینی منداڵەكەش بۆ شیرەكە كەمە وە لەم ماوەیەدا باشتروایە قەنداوی بدرێتێ .

دوای ئەم چەند كاتژمێرە دایك دەحەسێتەوەو منداڵەكەش كە تواناى مەمك مژینی لەلا پەیدا دەبێت ئەوسا منداڵەكە ئەدرێتە دایكی بۆ ئەوەی بیخاتە بەر مەمكی ، بۆ ئەوەی منداڵەكە هۆشیار بێتەوە بۆ مەمك مژین ، لێرەدا دەبێ دایك گۆی مەمكی لە ڕوومەتی و لێوی منداڵەكەی بخشێنێ بەم كارە منالەی زاری دەكاتەوەو بەدوای مەمكدا دەگەڕێ وەدەست بە مژینی دەكات ..

لێرەدا زۆربەی دایكەكان سەرناكەون لەوەی كە شیر بدەنە منداڵە كانیانو بیانووی نابەجێ دەبیننەوەو دەڵێن منداڵەكە مەمك ناگرێ لەڕاستیدا ئەم قسەیان ڕاستەو ئەو ئافرەتانەی كە تازە منداڵیان دەبێ بۆ چەند ڕۆژێك ئەوشیرەی كەدێت زۆر كەمەو تەنها « زرێچكاوێكی » واتە ئاوێكی زەردو مەیلەو سپیە كە بە كوردەواری خۆمان پێی ئەڵێن ژەك ، دوا بەدوای ئەم زرێچكاوە شیرەكە بەرەبەرە دەست بەزێدەبوون دەكاو دێتە مەمكەوە ، ئیتر وەكو گوتمان ئەم ئاوە زەردباوە بەلای ئەوانەوە شیر نیەو هەر بۆیەشە كە دەڵێن شیرمان نیە .؟!

یاخوت بەڵگەیتر دەهێننەوە وەك نەخۆشی ، یان دەڵێن كرێكارین ، یان فەرمانبەرین جا بەهەرجۆرێك بێت بەڵگە دەدۆزرێتەوەو بە ئاسانی دەبەزن لەشیردانی خۆیان بەمناڵەكانیان ، وە بە نزیكترین ڕێگە دەگەنە شیری ووشكو شوشەی شیردانو پەنای وەبەر دەبەن ئیتر بەم جۆرە منالی بەستەزمان ئەكەوێتە بەر ڕەحمەتی « میكرۆب » و هەڵسو كەوتی دایكی نەزان لە بەكارهێنانی شیری ووشككراوە ، كە ئەمەیشان لە دواییدا بۆمان ڕوون دەبێتەوە .

ئیتر منداڵەكە هەر زوو نەخۆش دەبێتو بەتایبەتی نەخۆشی سكچونو ڕشانەوە ، كە هۆیەكەشی هەوكردنی ڕیخۆڵەو گەدەیە بە هۆی ئەو « میكرۆب » ەی لە ئەنجامی بەكار هێنانی شیری ووشككراوەدا سەر هەڵدەدا ، كە مێشو دەستی نەشۆراو و تەعقیم نەكراو بۆ منداڵەكەی ڕادەكیشن ، بۆیە ئێستە ساڵ دوانزەی مانگ لە نەخۆشخانەكاندا نەخۆشی ی سكچوونو ڕشانەوەی منداڵان نابڕێت كە جاران پێش ئەوەی شیری ووشك باو بێت پێی ئەوترا سكچوونو ڕشانەوەی هاوینەی منداڵان .

لەڕاستیدا ئەم « زرێچكاوە ی » كە بۆ چەند ڕۆژی یەكەم لە مەمكی دایكی تازە منداڵ بووەكەدا دێتو تاكو نزیكەی پانزە ڕۆژ دەخایێنێ ئینجا دەبێت بە شیری تەواو ، ئەمە بەكوردی پێی دەڵێن « ژەك » وە لە ئەنجامی چەند باسێكی زانستی كە لەسەر « ژەك » دا كراوە، دەركەوتووە كە ئەم « ژەكە » زۆر شتێكی باشە بۆ منداڵەكە ، لەگەڵ مژینی منداڵەكە بۆ مەمكی دایكی ئەمە درووست دەبێت لەهەمان كاتیشدا خواردنێكی سوكە بۆ گەدەو بەرگرییەكی چاك بۆ منداڵەكە دروست دەبێت دژی ئەو نەخۆشیانەی كە لە تەمەنی ساوایەتی منداڵەكە توشی دەبێتو بۆ ماوەی شەش مانگ ئەم منداڵانەی ژەك دەخۆن زۆر كەم نەخۆش دەبن .

هەڵبەتە زۆربەمان گوێبیست بووین لە دایكو داپیرەمان كە منداڵێك گەر لەڕو لاواز بێت ، نەخۆشبێتو زیاد نەكات ، پێی دەڵێن ئەمە ژەكی نەخواردووە بۆیە چروساوە . جا بۆیە دەبێ زۆر هەوڵو كوشش بكەین بۆ ئەوەی دایكانی ئێمرۆش هەمان ڕێبازی دایكانی سەردەمی زوو پەیرەو بكەنو تا لە تواناياندا هەیە شیری خۆیان بدەنە منداڵە كانیانو بەتایبەتی لەڕۆژانی یەكەمی منداڵ بوندا و درێژەی پێبدەن تا ئەوكاتەی كە بە مسۆگەری بۆیان ساغ دەبێتەوە هیچ جۆرە شیرێكیان لەمەمكدا نەماوە ..

وە لە هۆیەكانیتر كە دایك سەرناكەوێ لەوەی ببێتە شیردەری منداڵەكەی ، ئەویش ئەوەیە كە نازانێ بەڕاستیو چۆن مەمكی خۆی بخاتە ناوزاری منداڵەكە ، كە زۆربەی دایكە تازە پێگەیشتوەكان كە بۆیەكەم جار شیر دەدەنە منداڵەكانیان واتە منداڵی نۆبەرە ، تەنها سەری گۆی مەمكیان دەخزێننە ناو زاری منداڵەكەو لە هەردوو لای زاری منداڵەكەش كلۆراییەك دەمێنێتەوەو منداڵەكە لە وەختی مژینیدا لەجیاتی شیر هەوا دەمژێتو نەختێكی زۆر كەم لە شیر دەچێتە ناوزاری منداڵەكەو زۆر بە زوویی ماندوو دەبێتو بەمەش پەیتا پەیتا شیری دایك ڕوو لە كەمی دەكاتو منالەكەش ڕۆژ لە دوای ڕۆژ بەرەو كزی دەچێتو لەڕو لاواز دەبێتو ئەچروسێتەوە جگە لەوەی كە منالەكە هەمیشە لەبرسانا دەگرییتو كەم خەو دەبێت لەبەر ژانی سكی ، چونكە پڕدەبێت لە هەواو ڕیخۆڵەكانی دەپەنمێت .

بەلام ئەگەر هاتوو دایك توانی بەراستی مەمكی خۆی بخاتە نێو زاری منداڵەكەی ، واتە گۆی مەمك لەگەڵ ئەم رەشایەتیەی كە لەدەوری مەمكدا هەیە نەختێكی بچێتە ناو زاری منداڵەكە ئەوە منداڵەكە بە ئاسانی دەتوانی مژی لێبدات و شیرەكەیش بە باشی دەچێتە ناو زاری منداڵەكەو تێر دەبێت و كێشی بە باشی زیاد ئەكات و رۆژ دوای رۆژ دەبوژێتەوەو گەورە دەبێت ، جا ئەگەر هاتو دایك بەچاكی پەیرەوی ئەم خاڵەی دوایی نەكرد ئەوە زۆر بە ئاسانی منداڵەكە لە شیری دایكی دادەبرێ و ئیتر بیرای ببڕ توخنی ناكەوێ ئەوكاتەیش دایك پەنا دەباتە بەر شیری وشككراوەی قوتو كە دەتوانین بە « سەرهەڵقەنەی » منداڵ ناوی بەرین ، بۆیە بە پیوستی دەزانم بەردەوام ئەو دایكانەی یا ئەو ئافرەتانەی سكپڕن ئامۆژگاری تازە وەربگرن و سوودی لێ وەربگرن لەپێناوی پەروەردەكردنێكی سەركەوتووی منداڵەكانیان بۆ ئەم مەبەستەیش چاكتر وایە ڕوو بكاتە مەڵبەندەكانی چاوەدێری دایكو منداڵ « مراكز رعاية الأمومة والطفولة » ، كە لە گشت شارەكانی وولاتدا هەن و ئامۆژگاری لەو زاناو پسپۆرانە وەربگرن كە لەم شوێنانەدا كار دەكەن بۆ ئەوەی چاكترین رێ و شوێنیان پێ نیشان بدەن لەبابەت چۆنیەتی شیردانە منداڵ و ئەوەیان بۆ شیبكرێتەوەو فێربكرێن كە چۆن مەمكی خۆیان ئامادە بكەن بۆ منداڵەكانیان ، كە دوای چەند مانگێك دێتە سەر دونیا ، كە ئامۆژگاریەكانیش بە كورتی ئەمانەن : ـ

1 — نابێ مەمكی دایكی سكپڕ بە توندی بە مەمكدان ببەسترێت

2 — هەموو رۆژێ جارێك لەسەرخۆو بە هێمنی مەمكی خۆی بشێلێ و سەرە گۆیەكەی بۆ لای سەرەوەو دەرەوە بە ئەسپایی رابكێشێ .

3 — خواردنو خواردنەوەی باش و بە نرخ كە بریتی بن لەم جۆرە ڤیتامینانە « ڤیتامین A و ڤیتامین D و « ڤیتامین C » « وە ئاسن و كالیسیوم » كە ئەمانەیش لە شیرو ماست و هێلكەو گۆشت و سەوزەو میوەدا هەن ، جگە لەچەند ڤیتامینێك كە پێوستن لەگەڵ ئاسندا بەشیوەی حەب دەدرێنە ئافرەتی سكپڕ لە كاتی نەخۆشی كەمخوێنی كە زۆربەی دایكەكان دوو چاری دێن لەوەختی سكپڕیدا یا بەر لەسكەكەیانەوە هەر كەمخوێن دەبن .

4 — دایك یان خەسو ، یان هەر ژنێكی بەتەمەندا چوو كە لە كاتی خۆیدا شیریان داوە بە منداڵ ، ئامۆژگاریان باشەو پێوستە . لەهەمان كاتدا فێربون لەو دایكانەی كە دەزانن بەرێگەیەكی راست شیری خۆیان بدەن بە منداڵ كارێكی تابلێی پێوستە .

**خاسیەتە باشەكانی شیری دایك : ـ**

1 — شیری دایك تا رادەیك كار دەكاتە سەر ئابووری خێزان و وولاتیش ، چونكە هیچ پارەیەكی تێناچێ بە پیچەوانەی شیری ووشككراوە كە بە پارەیەو بە پارەیەكی گرانیش دەكردرێت لە وولاتانی دەرەوە ..

2 — شیری دایك پاك و خاوێنەو یەكسەر لە مەمكی دایك دروست دەبێت و دەچێتە ناو زاری منداڵ بە هەمان پلەی گەرمایی لەش و بەو رێژەی كە پێویستە بو منداڵ چەوری تێدایەو بۆ هەروەختێكی تەمەنی منداڵ دەست دەدات ، بۆ سەلماندنی ئەم راستی یەش ئەم منداڵانەی كە شیری دایكیان دەخۆن زۆر كەم توشی نەخۆشی زگچوون دەبن گەر هاتوو بەراوردمان كردن لەگەڵ ئەوانەی شیری ووشككراوەی قوتو دەخۆن .

3 — بەرگری « مەناعە » : ـ هەروەك لەمەوبەر باسمان كرد زەكی دایك لە چەند رۆژانی پاش لەدایكبوونی منداڵەكە بەرگری دەداتە منداڵەكە ، بەرامبەر بەو نەخۆشیانەی كە یەك لەیەكتری دەگیرێتەوە ، واتە منداڵ دەپارێزێ و نایەڵێ توشی ئەو نەخۆشیانە بێ تاكو تەمەنی شەش مانگ .

4 — شیری دایك پەیوەندیەكی باش درووست دەكات لەنێوان دایك و منداڵەكەی ، منداڵەكەیش لە داهاتوودا زیرەكو پیاوانەو باوەڕ بەخۆ دەبێت .

5 — لەم چەند ساڵانەی دواییدا چەند زانایەك ئەوەیان سەلماندووە كە گوایە ئەو منداڵانەی شیری دایك دەخۆن زۆر كەم توشی نەخۆشیە كوشندەكانی دڵو گیرانی شا دەمارەكانی ناودڵ دەبن لە تەمەنی گەورەییدا .

6 — ئەو دایكەی كە لە رۆژانی یەكەمی منداڵ بوونیدا واتە كە هێشتا چلەدارەو زەیستانە شیری خۆی بداتە منداڵەكەی ئەوە لەوكاتەدا جۆرە هۆرمۆنێك كە لەبن میشكەوە دێتە نێو خوێن لە ئەنجامی مەمك مژینی منداڵە ساواكە ئەو هۆرمۆنە كار دەكاتە سەر زیدە بوونی شیری دایك و هۆیەكی سەرەكی یە بۆ ئەم مەبەستەو لەهەمان كاتیشدا منداڵدانی دایك لەرێگەی هۆرمۆنێك كە لە هەمان سەرچاوەی سەرەوە كە باسمان كرد دەرژێتە نێو خوێن و لە ئەنجامی مەمكمژین



هەردیسان دەبێتە هۆی ئـەوەی کە منـداڵدانەکـە زووتر گچکە بێتەوەو بچێتەوە دۆخو باری جارانی بە ئاسانیو بە پێچەوانەی ئەوانەی کـە شیری ووشـککراوە دەدەن بـە منداڵەکانیان ، واتە شیری دایك کار دەکاتە سەر جوانیو ڕێکوپێکی بەژنو باڵای ئەو دایکەی شیـری خۆی دەداتـە منداڵەکەی ورگی زل نابێت وە سکی هەمـوو دەم بچووك دەبێت .

لەم چەند ساڵانەی دواییدا ئـەوەش شیکراوەتـەوە کە ئـەو ئافرەتەی شیری خۆی بداتە منداڵەکەی زۆر کەم توشی نەخۆشی شێرپەنجەی مەمك دەبێت کە نەخۆشی‌یەکی کوشندەیە .

## هۆیەکانی کەمشیری دایك

١ — لەڕاستیدا دایکێك کە تەندروستی باش بێتو بەناو ساڵاندا نەچووبێت شیـرەکەی ڕۆژ بـە ڕۆژ لەزیادبـووندا دەبێتو باشتر دەبێت ، بەڵام کە دایکێك نەخۆشی کەمخوێنی هەبێت لەکاتی سکپڕیدا و هیچ چارەسەرێکی خۆی نەکـردبێت ئەوە ئەو دایکـە بێ‌سێودوو شیری کـەم دەبێت زۆربەی دایکانی ئیمرۆ لەسەرەتادا شیری خۆیان دەدەنە منـداڵە کانیان ، بەڵام کە منداڵەکە ڕووبەڕووی بچوکترین نەخۆشی دەبێتـەوە ئەوە زۆر بـە هـاسـانی شیـرەکـەی خـۆی لێ دەگرێتەوەو تاوانەکەش دەخاتە ئەستۆی شیرەکـەو دەڵێ شیرەکەم کەمەو برسێتی منداڵەکە ناشکێنێ ، کەچی گەر بە وردی لە مەسەلەکە بکۆڵینەوە دەردەکەوێ کە منداڵەکە لەبەر برسێتی ناگریو هاوار ناکـات بەڵکـو وەکو شتێکی سرووشتی ئەو منـداڵەی تازە دەبێت تـا چلەی دەرواتو دەگاتە سێ مانگە گرینەکەی هەر هەیەو هۆیە گرینگەکەیش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە سکی منداڵەکە با دەکاتو ئەویش لەبەر ئەوەی کە ئەنزیمەکانی نێو ڕیخۆڵەو گەدە لەگەڵ ترشی گەدە بە تەواوەتی بەکار نەکەوتوون بۆ هەرسکردنی ئەو شیرەی دەیخوات ئیتر بۆیە بەردەوام دەگریو دەبێتە هۆی بۆگەن بوونی شیر لەناو زگی منداڵەکەداو چەند غازاتێـك پەیدا دەبێتو پاڵەپەستو لەناو ڕیخۆڵەی منداڵەکە زۆر زیاد دەبێتو دەبێتە هۆی ئەوەی کە زگی منداڵەکە بە توندی ژان بکات ، جگە لەم هۆیە شتێکی تریش هەیە کە زۆربەی خەڵك نازانن ئەویش ئەوەیە کە منداڵ دوای ئەوەی لەدایك دەبێ جگە لە ڕەوشتی سرووشتی « غريزة » ی بـرسی بوون ، ڕەوشتی سـرووشتیی مژینیشی هـەیە واتـە گەر هـاتوو منداڵەکەمان تێرکرد بەو شیرەی کە پێـویستە ، دەبینـین پاش تێر خـواردنیش منداڵەکـە هەر دەگـرێتو دەیەوێت مەمکەکە بمژێ بەڵام ئەمجارەیان تـەنها مـژینو بەس ، چونکە تێربووەو پێویستی بە خواردن نەماوە ، ئیتر تـا لە غەریزەی مژینیش تێر نەبێت ئەوە هەر دەگریو بێ‌دەنگ نابێتو ناخەوێ ، جا هەرکە ئەو غەریزەیشی دامرکاندەوە ئەوە کپ دەکەوێو بێ دەنگ دەبێ هەر لەبەر ئەم هۆیەشە کە مەمکۆڵەی لاستیکی دەستکردی بچووك دروست کراوە کە پێویستە بۆ منداڵ تاکو دەگاتە تەمەنی سێ مانگەو بەس ، بەڵام لەلای ئێمە دەبینین تاکو تەمەنی دوو سێ ساڵانەیش هەر دەیدرێتێ کە ئەمەیشیان هەڵەیەو خراپە چونکە کـار دەکاتە سەر منداڵەکە لە داهاتوویدا ، بۆنموونە زۆر زیرەك نـابێتو ڕەنگـە نـەختێکیش هـوربێت ، هـەروەهـا ئـەو منالانەیش کە تەمەنیان گەیوەتە دوو ساڵ هەیە مەمکۆڵەی شووشەو شیـری ووشکـکـراوە دەخۆن ، بـۆیە هـەردەم پـزیشکی منداڵ ئـامۆژگـاری دایکان دەکـات بۆ ئـەوەی منداڵەکانیان لە شیری نێو مەمکۆڵەی شوشە بکەنەوە و زوو فێری ئەوەی بکەن کە خواردنی تر بخوات دوای تەمەنی یەك ساڵە بەکوب یا بە بەرداغ شیری بدرێتێ .

لەبەر ئەم چەند هۆیەی کـە باسمـان کرد دایکـەکە وا تێ‌دەگات کە شیرەکەی کەمەو ئیتر دەست دەکاتە ئەوەی کە

شیری ووشك بداتە منداڵەكەی ویـرای شیرەكـەی خۆیشی ، دەبێ ئەوەشمان لەبیر نەچێ كە زۆربەی شیری ووشككراوە شەكری تێدایە وەیان خۆمان شەكری تێ دەكەین پێش ئەوەی بدرێتە منداڵەكە ، ئیتر تامەكەی شیرینو خۆشتـر دەبێت لەو شیرەی كە لە مەمكی دایكدا هەیە بۆیە ووردە ووردە منداڵەكە واز لە شیری دایكی ئەهێنێتو ڕوو دەكاتە شیری ووشككراوەو بەم هۆیە هەروەك لە پێشەوە گوتمان تاكو منداڵ كەمتر شیری دایكی بمژێ ، ئەوە شیرەكە كەمتر دەبێتەوە تاكو بەجـارێك ووشك دەبێت .

2 — بـەشێك لەدایكـان دێتو دەڵێ شیرم كـەمە ، بـەڵام كـە تەماشای كێشی منداڵەكە ئەكەین لەگەڵ تەمەنیدا دەبینین ئەنجامەكەی زۆر باشەو زیاترە لەوەی كـە پێویستـە لەم تەمەنەدا بێت ، كەچی دایكەكە وای بەباش دەزانێ كـە ئەگەر هاتوو مەمكی خۆی دۆشی دەبێ گـورج دەپەڕێتـە دەرەوە ، بـەڵام لە ڕاستیدا شیری دایـك ئـەوكـاتـەی منداڵەكە كە دەی مژێت ئەوسا پەكسەر دروست دەبێتو بە ئاسانی دەچێتە ناو زاری منداڵەكەو دەتـوانین ئـەمە بـە ئاسانی بۆ دایكەكە شی بكەینەوە بۆ ئەوەی باوەڕی بـەوە هەبێت كە كەم شیر نیە ئەویش بەم ڕێگەیـەی خوارەوە : منالەكە بە برسیەتیو بە هـەموو شتێكیـەوە دەكێشێنو ، پاش ئەوەی دەیخـەینە سـەر مەمكی دایكی بـۆ ئەوەی بیمـژێتو بۆ مـاوەیەكی بـاش تاكـو منداڵەكـە خۆی واز دەهێنێت ئـەو مـاوەیـەش نیـزیكـەی 15 — 25 دەقیقـە دەخایەنێ ، ئینجا دووبارە منداڵەكە بەهەمـوو شتێكیەوە دەكێشینەوەو فەرقی ئەم دوو كێشانە ئەو شیرەیە كـە لە مەمكی دایكی خواردوویەتی لەم ماوەیە كورتەدا ئەوسا بە چاكی دەزانین شیرەكەی كەمە یان زۆرە .

3 — كەم شیری ڕاستی : —

ئەویش لە ئەنجامی چەند نەخۆشیەكدا دەبێت كە هێزو توانای دایك كەم دەكاتەوەو ڕێگەی ئەوەی لێ دەگرێت كە خواردنی باش بخوات ، هەروەك نەخۆشی سیلو شێرپەنجەو كەمخوێنی

4 — سكپڕیو شیردان بە منداڵ : —

لە كۆنەوە زۆ بەمان گویمان لەوە بووە كە فلانە ئافرەت شیری پیس‌بووە وەیا شیری پیس دەداتە منداڵەكەی كەچی لە ڕووی زانستیەوە شیر پیس‌نیەو هیچ ترسێك نیە لەسەر ئـەوەی كە



دایكی سكپڕ شیری خۆی بداتە منداڵەكەی ، بەڵام دایارە ئەم شتـە لەوەوە هاتـووە كە دایكی سـكپڕ خـۆی كەمخـوێنـەو كەمخۆریشە چونكە زۆربەیـان بێز لە زۆربـەی خواردنـەكان دەكەنەوە ، وە لەم وەختە خواردن زۆر پێویستە بۆ دایكو منالی ناو سكیو ئەوەی بەر مەمكی ، لەبەر ئەم هۆیە شیـری كەم دەبێتو بـەشی منداڵەكـە ناكـاتو برسی دەبێتو لەڕ دەبێتو منداڵەكە ئەچرۆسێت ، ئینجا لە كوردەواریدا خۆمان ئەڵێین شیرەكەی پیس بووە وەیا شیرێژەی دەكات .

5 — شێت بوونی دایكو شیردان : —

نابێ منداڵ بدرێتە دەست دایكی شێت ، چونكە نـەك تەنهـا منداڵەكە برسی دەبێت بەڵكو ترسی ئەوەشی لەسەر هەیە نەوەك منداڵەكە لەبەر هەر هۆیەكی ترەوە بەدەستیەوە بمرێت .

6 — گەر هاتو یەكێ لە مەمكەكانی دایك دوومەڵی دەركرد بـوو ئەوە نابێ لەو مەمكە شیر بداتە منداڵەكەی تاكو بە تەواوی چاك دەبێتەوە ئینجا دەتوانێت شیرەكە بـداتە منـداڵەكە بەمەرجێ شیرەكەی ووشك نەبووبێت .

7 — لە وەختی تەقینی سەرە گۆی مەمكو شەقار شەقار بوونیو یا كە توشی هەوكردن دەبێت هەوی كەڕو « Monilia » تاكو زاری منداڵەكەش تووشی نەخـۆشی مونیلیـا ئەبێت كـە لە ئەنجامیا زاری منداڵەكە كول دەبێتو برینی سپی پەڵە پەڵە پـەیدا دەبێتو منـداڵەكە لە هـەموو جـۆرە خـواردنێـك دەكەوێت ، جا لەبەر ئەم هـۆیە دەبێ شیـری ئەو جـۆرە

مەمکانەی تووشی ئەم نەخۆشیە دەبن نەدرێتە منداڵەکە هەتاوەکو بە تەواوی چاک دەبێتەوە .

## باسی دووەم
### شیردانی دەستکرد
### Artificial Feeding

**شیردانی دەستکرد یا سەرهەڵکەنەی منداڵان لە چەرخی بیستەمدا : ـ**

ناونیشانی ئەم باسەمان سەیرە ؟!، هەموومان گوێمان لە شیری ووشك بووە بەڵام ترسناکە ، کە لەهەقیقەتدا دەقاو دەق راستەو بەڵکو لەوە زیاتریش دەگەیەنێ ، هەرچەندە یەکەمین جارە ئەم راستیە دەزانی ، بەڵام راستیەکی تاڵە بەڵێ تاڵە ئەگەر هاتو زانیت ئەو منداڵانەی راستەوخۆو ناراستەوخۆ بەهۆی شیری ووشك کراوە دەمرن چەندن ئەوکاتە بەلاتەوە سەیر نابێت گەر ناوی بنێین سەرهەڵکەنەی منداڵان هەربۆیە منیش ئەم ناوە کوردیەم بۆی هەڵبژارد لەجیاتی (قەسابی منداڵان) کە لەسەردەمی شیری ووشك کراوە لە وولاتانی رۆژئاوادا پەیدابوو و ئەو ناوەی بۆ دانرا ، وە لەلای خۆشمان ئێستە ئەم سەرهەڵکەنەیە پر بە پێستی خۆیەتی .

شیری ووشك خۆی شیری مانگایە بە چەند ئامێرێك ووشك دەکرێتەوەو ئەهاردرێت و چەند ڤیتامینێکی تێ دەکرێت و ئەم کارانە هەمووی بە رێگەیەکی خاوێن و پاك ئەنجام دەدرێن لە کارگەکانی شیری ووشك کراوە .

دووبارە کردنەوەی بە شیری شل و ئاو تێکردنی و ئامادەکردنی بەم شێوە هاسانییەی کە دەیبینین چۆن دایکان ئامادەی دەکەن و دەیدەنە منداڵەکانیان زۆر لە رێگەی تەندروستی پەیرەو کراوەوە دوورە چونکە ئەو دایکەی شیرەکە دەگرێتەوە دەبێ دەستەکانی زۆر پاك و خاوێن و تەعقیم کراوبێت و کەلوپەلەکان بەجوانی خاوێن بکرێتەوەو لە شوشەیەکی خاوێن و تەعقیم کراوی بدرێتە منداڵەکەو هەروەها رێژەی ئاو لەگەڵ شیرەکە دەبێ تەواوبێت و دەبێ ئاوەکە تەعقیم کرابێ واتە کوڵاوبێت و سارد کرابێتەوە ، بو ئەو رادەیەی کە منداڵ بتوانێ بیخواتەوەو دەمووزاری نەسوتێنێ و ئەوەندەش سارد نەبێت کە زگی پێ ژان بکات ، دایك دەبێ دەستەکانی زۆر چاك بە ئاوو صابون بشوات و کیفی سەر مەمکۆڵەکان لە جێگای خۆی بێت و قوتی شیرەکە لە شوێنێکی چاك و دوور لە دەستی منداڵەکانی تری بێت و ، شوشەی شیرەکە پێش شیردان و پاش شیردان دەبێ جوان بە « صابون » یان بە تاید وە بە هۆی فلچەی تایبەتی بەتین پاك بکرێتەوە ، هەروەها سەرە مەمکۆڵەکە بە فلچەی بچووك پاك بکرێتەوە چونکە مانەوەی چەوری و شیری زیاد ، کە لەنێو مەمکۆڵەکە دەمێنێتەوە زوو بۆگەن دەبێت و میکرۆب لەناوی زاوزێ دەکات و دەبێتە هۆی نەخۆشی بۆ منداڵەکە .

**ئەم کەلوپەلانەی کە پێویستن بۆ شیر ئامادەکردن بۆ منداڵ ئەمانەن : ـ**

1 – مەنجەڵێکی گەورە بۆ کوڵاندنی شوشەکان و کەلوپەلەکانی تر .
2 – سێ چوار شووشەی شیردان لەگەڵ سەرە مەمکۆڵەکانیدا .
3 – فلچەی تایبەت بۆ شوشتنی سەرە مەمکۆڵەکان و فلچەی تایبەت بۆ شوشتنی شووشەی شیردان .
4 – دەستکێشی تایبەتی و خاوێن بۆ ئیش پێکردن لە وەختی ئامادەکردن و شوشتنی کەلوپەلەکان .
5 – ترمسێکی پاك و خاوێن بۆ هەڵگرتنی ئاو لە پلەیەکی گەرمای پێویستدا .
6 – رەحەتیەکی بە هێڵەك .
7 – قاپێکی قووڵ کە نیشانەی قەبارەی تیدا هەبێت .
8 – کەوچکێك بۆ تاواندنەوەو تێکدانی شیرەکە

**رێگاکانی تەعقیمکردنی کەلوپەلەکان : ـ**

پێش دەستکردن بە « تعقیم » کردنی کەلوپەلەکان دەبێ شوشەکان و سەرەکانیان لەگەڵ مەمکۆڵەکان جوان بە فلچەو تاید ، وەیاخود صابون دەشووریت بۆ ئەوەی هەرچەوراتیەك و یاخود پاشماوەی شیر کە هەبێت لێی بێتەوە ئینجا لەم دوو ریگایەی خوارەوە یەکێکیان بەکار دەهێنین :

**1 – تەعقیم کردن بەهۆی کوڵاندن :**

هەموو کەلوپەلەکان دەخەینە ناو مەنجەڵەکەو دای دەنێینە سەر ئاگر پاش ئەوەی مەنجەڵەکە پر دەکەین لە ئاو ، تاکو دەست بە کوڵان دەکات دوای 3 – 4 (دەقیقە) سەرە مەمەکان دەردەهێنین و ، دووبارە بۆ ماوەی چارەکە سەعاتێك

کەلوپەلەکانی تر دەکوڵێنین .

2 – حەبی تایبەتی هەیە دەیخەینە نێو ئـاوی مەنجـەڵەکە وە شتەکانی لەنێو دادەنێین بۆ ماوەی چارەکە سەعاتێك ئینجا دوای ئەوەی شتومەکەکان تەعقیم دەبن دەریان دەهێنین .

پاش ئەوەی کەلوپەلەکـان تەعقیم دەکـرێن لە شوێنێکی پـاك دادەنـرێن‌و شووشـەکان یـەك‌یەك بـەکار دەهێنـرێن ، ئیتـر بەردەوام دوای بەکـارهێنانیـان دووبارە دەشـۆرێن‌و تەعقیم دەکرێن بۆ ئەوەی هەردەم بە پاکو خاوێنی بمێننـەوە ، لەگەڵ ئەوەشدا بەلای ئێمەوە دایك ئەگەر بتوانێ ڕۆژانە شووشەی شیری منداڵەکەی بەجوانی بە ئاوو تاید وەیا بە صابون لەگەڵ فلچەی تایبەتی بیشوات بەر لە شیردانە منداڵەکەی هەروەها دوای شیردانیش ئەمیشیان هەردیسان تا ڕادەیەك پەسندەو چاکترە لەوەی کە هەر گـوێی پێ‌نەدات ، چـونکە زۆربـەی دایکـەکان کـە ڕۆژانە هـاتوچـۆمان دەکـەن وە یا کـە لەگەڵ منداڵەکانیان لە نەخۆشخانەدا دەخەون دەیانبینین نـەك هەر شووشەکە تەعقیم ناکەن بەڵکو هی وایش هـەیە هـەر نازانێ شوشتنی شووشەی شیر چی‌یەو زۆربەی مەمکۆڵەکانیان بۆنی لێدێت .. وە ئەو شیرەی کـە دەشی گرێتـەوە بە ئـاوی بۆڕی دەی‌گرێتەوە ،کە لێشی دەپرسی چەند ئاوو چەند شیرت تێکەڵاو کـردووە ؟ زۆر بە هـاسانی دەڵێت چـۆنم بۆ ڕێکـەوت ئاوای دەگرمەوە .. ئینجا لەوەش زیاتر بەر لەوەی مەمکۆڵەکە بخاتە زاری منداڵەکەی خۆی پێشتر مژێکی لێدەدات بۆ ئەوەی بزانێ شیرکە ساردە یا گەرمە ، بێ‌ئەوەی بیرلە خراپیەکەی بکاتەوە ، چونکە گەر زاری دایك لەگەڵ زاری منداڵەکەدا بەراورد بکەین ئەوە زۆر لەیەکتری دوورن ، زاری دایك زۆر میکـرۆبی وای تیایە کە بە زەحمەت کارلەو دەکەن بەلام زۆر بە هاسانی کارلە منداڵەکەی دەکات گەرهاتو مەمکۆڵەی پێشتر نا بە زاری خۆی ئەوە گورج ئەو جۆرە میکـرۆبانـەی لە زاری خۆی دا هـەن دەگوازێتەوە بۆ زاری منداڵەکەی ، دەبێ ئەوەش بڵێین کە ئەم جۆرە میکرۆبانە بۆ منداڵی ساوا زۆر بە ئازارو کوشندەن .. جا بۆیە ئامۆژگاریمان بۆ هەموو دایکان ئەوەیە کە هەتا دەتوانن لە شیـری خـۆیـان بـەولاوە شیـری وشـككـراوە نـەدەنـە منداڵەکانیان ، وە ئەگەر هەر ناچاربوون دەبێ بەوپەڕی پاك‌و خاوێنی بێت‌و پەیڕەوی ئەو خاڵانە بکات کە لە پێشەوە باسمان کردن ئەگینا ئەنجامەکەی خراپ دەوەستێتـەوە بە نیسبـەت منداڵەکەی‌و ئەو شیرەی کە بەلای ئەوەوە سوودبەخشە ئەوە هەروەکو گووتمان دەبێتە سەرهەڵکەنەی ئەو منداڵە ساوایە بێ تاوانەی کە چاوەنواری ئەوەی لێدەکرێ لە پاشەڕۆژدا ببێتە چاکترین ئەندامی کۆمەڵەکەی .

## : ڕێگاکانی ئامادەکردنی شیر بۆ منداڵ :

هەردایکێك کـە دەیەوێ شیـری قوتـو بۆ منـداڵەکەی بگرێتەوەو ئامادەی بکات دەبێ بەر لە هەموو شتێك دەستەکانی پاك‌پاك بە ئاوو صابون بشوات‌و پاشـان بە خـاولی‌یەکی پـاك دەستـەکـانی وشـك بکـاتـەوە ، ئـەگـەر بـۆشی بگـونجێ دەستکێشێکی تەعقیم‌کراو بکاتە دەستی خۆ هەر زۆر باشترە ، ئینجا شووشەیەکی شیری « مەمکۆڵە » ی پاك ، هەرچەنـدە زۆربەی دایکان شیرە وشکەکە دەکەنە نێو شووشەکەو ئاوی ساردی بەسەردا دەکەن کە ئەمـەیان لەڕووی زانستی‌یـەوە ڕاست‌نی‌یە ، بەڵکو دەبێ ئاوەکـە بکرێتـە نێو قـاپێکی قووڵ بەپێی پێویست واتە بۆ هەریەك « ئـونس 30 سی‌سی » ئاو بـە کەوچکی شیر دەکرێتە نێو ئاوەکەوە ، ئەوسـا بە کـەوچکێکی تایبەتی‌و خاوێن شیرو ئاوەکە جوان جوان تێکەلاو دەکرێت بۆ ئەوەی هیچ گرێ‌یەکی تێـدا نەمێنێتـەوە ، پاشـان شیرەکـە دەکـرێتە نێـو شووشـەکـە ئـەویش بـەهـۆی ڕەحـەتیـەکی هێلەك‌دارەوە ، ئیتر بۆدواجـار سەری مـەمکۆلەکـە دەگرین‌و بەهێمنی دەیدەینە منداڵەکە ، وەدەبێ کونی سەری مەمکۆڵەکە بەجۆرێك بێت کە ئەگەر هاتو شـووشەکـە سەراوبن گیـرا بە ئاسانی شیرەکە دڵۆپە دڵۆپە بێتە خوارەوە بەمەرجێ کە نەزۆر بێت‌و نەکەم .

## : شیری مانگای دۆشراو :

ئەگەر هاتو شیری مانگا درایە منداڵ ئەوە دەبێت بـەر لەهەموو شتێ شیرەکە بە ڕێگەی باستۆر تەعقیم بکرێت ، واتە شیرەکە بە جوانی بکوڵێندرێت ، پاشان سارد بکرێتەوە ، ئەو شیرە بۆ منداڵی تازە لەدایك‌بوو تا تەمەنی پێنج مانگی هەرچی چەوری‌یەکی تیایەتی لێ‌ی دەگیرێ ، وەگرتنەوەکەیش تـاکو تەمەنی سێ هەفتە دوای لەدایك‌بونی منداڵ بۆ هەر پیاڵەیـەك شیر یەك پیاڵە ئاوی تێ‌دەکرێت ، لەوە بەدواوە تاکو تەمەنی سێ مانگ لە دوو پیاڵە شیر یەك پیاڵە ئاو ئامادە دەکرێت ، وە دوای ئەو تەمەنەیش شیرەکە بەبێ ئاو دەدرێتە منداڵەکە .

## : چەند شەکر لە شیر دەکرێت ؟!

لەراستیدا زۆربەی شیری ووشککراوە کە دەدرێتە منداڵ خۆی شەکری تێدایە ، وە ئەو شیرەی کە شەکری تێدا نەبێت بۆ هەر « 60 سی‌سی » کە دەکاتە دوو « ئۆنس » واتە یەك پیالە یەك کەوچکی چای بچووك شەکری تێ‌دەکرێت .

## : جۆرەکانی شیری ووشککراوە

ئەگەر نەتواندرا شیری مانگای تازە دۆشراو بۆ منداڵەکە ئامادە بکرێت شیری ووشك دەدرێتە منداڵەکە و بەم جۆرەی خوارەوە :

أ ـ ئەو شیرانەی کە بە شیری دایك دەچێت ئەمانەن شیری « سیمیلاك ، نان ، مای‌بۆی ، ئەلدۆرین » کە هەیانە نیوە چەورن و چەوری تەواون .

ب ـ شیری ترشکراو : ئەو جۆرە شیرانە بۆ منداڵی نەخۆش و منداڵی لەرو ئەوانەی کە زۆر سکیان دەچێت بەکار دەهێنرێت ، وە نمونەی ئەو شیرانەیش شیری « پلارگۆنە » .

ج ـ شیری کیکۆز کە دوو چەشنی هەیە نیوە چەور و چەوری تەواو .

د ـ شیری شلەی پەیت‌کراو بەهۆی هەڵم لێ هەڵستاندن و بەهۆی گەرمی ، ئەم جۆرە شیرەیش شەکری تێکراوە و لە وەختی ئامادەکردنیدا تەنها بەپێی پێویست ئاوی تی‌دەکرێت .

هـ ـ شیری « نیدۆ » کە چەوریەکەی تەواوە و بێ شەکرە

## ● منداڵ لە مەمك کردنەوە ●

منداڵ لە مەمك کردنەوە واتە کۆتایی بە شیری مەمك بهێنرێت و دایك خواردنی تر بداتە منداڵەکەی جا بۆ ئەوەی ئەم کارە نەبێتە شتێکی کتوپڕی بە نیسبەت منداڵەکەو نەبێتە هۆی هەوکردنی ریخۆڵەکانی و کاری دەروونی نەکاتە سەر منداڵەکە ، بۆیە باشتر وایە هەر لە تەمەنی چوار مانگی‌یەوە دایك هەوڵی ئەوە بدات خواردنی تر بخاتە نێو خۆراکی منداڵەکەیەوە بەلام بە شێوەیەکی هێمن و لەسەرەخۆ ، هەرچەند رۆژێك جۆرە خواردنێك ، نەك چەند خواردنێك بە جارێك بۆ ئەوەی لە خواردنەکە نەتۆرێت ، وە بە گشتی منداڵ لە مەمك کردنەوە چاکتر وایە لەنێوان تەمەنی (12 — 14) مانگی بێت ..

هەروەها دایکان دەبێ لەوەش ووریابن کە نابێ منداڵەکانیان لە رۆژانی زۆر گەرمی وەرزی هاویندا وەیا لە کاتی نەخۆشی‌دا لە مەمك بکەنەوە چونکە کار دەکاتە سەر تەندروستی منداڵەکە جگە لەمەیش دەمانەوێ دایکان ئاگادار بکەین کە مەبەستمان لە ووشەی خواردنی‌تر ئەم جۆرە خواردنانەیە :

ـ ئاوی میوەی گوشراو بە گوێرەی وەرزی سال ، وەك ئاوی پورتەقاڵ ، تەماتە و شووتی و ترێ ... هتد وە سێوی لە رەندە دراو ، هەروەها چەند جۆرە خواردنێکی تری بدرێتێ وەك « سیریلاك و کاستەر » جگە لە مانەیش زەردێنەی هێلکە بە نیوە کولاوی بە دەلەمەیی دەدرێتە منداڵ ئەویش لە تەمەنی چوار مانگی تاوەکو تەمەنی یەك ساڵی دوای ئەم تەمەنەیش دەکرێ هێلکەی تەواو بە کولاوی بیدرێتێ ، دوای تەمەنی پێنج مانگیش منداڵ سوود لە خواردنی ماست دەبینێت و بۆ دایك هەیە ماستی بداتێ ..

هەروەها بۆ ئەوەی منداڵ تووشی نەخۆشی کەم‌خوێنی و ئیسقان نەرمی نەبێت ڤیتامینات و دەرمانە بەهێز بەرەکانی دەدرێتێ بۆ ئەوەی هەموو ئەندامەکانی نەرمی نێو لەشی منداڵەکە بەهێزبن ، ئەمانەیش تاوەکو تەمەنی منداڵەکە دەگاتە ساڵێك بەکار دەهێنرێت ، ئیتر دوای ئەو تەمەنە منداڵەکە بەپێی خۆی دەڕوات و هەوڵی ئەوە دەدات خواردن بۆ خۆی پەیدا بکات و بەدوایدا دەگەڕێت .

## : چۆن دەزانین منداڵ چەند شیری پێویستە

ئەو شیرو خواردەمەنی‌یەی منداڵ پێویستی پێ یەتی بە پێی تەمەن و کێش و باری تەندروستی منداڵەکە دەگۆرێت ، منداڵی لەش‌ساغ واتە تەندروستی باش پێوستی بە « سوعراتی » گەرمایی زیاتر هەیە لە منداڵی نەخۆش ، هەروەها منداڵی لەرو لاواز زیاتر پێوستی پێ‌ی هەیەوبە گشتی ئەو شیرەی کە منداڵ پێوستی پێ‌یەتی بەم شێوەی خوارەوە دەتوانین دەستنیشانی بکەین : بۆ ماوەی 24 سەعات واتە شەوو رۆژێك بۆ یەك کیلۆگرام لە کێشی منداڵەکە پێویستیمان بە

165 سی‌سی) شیر هه‌یه ، واته گه‌ر منداڵێك كێشه‌كه‌ی پێنج كیلۆگرام بێت پێویستی به « 125 سی‌سی » شیر هه‌یه بۆ یه‌ك ڕۆژ وه ئه‌مه‌یش به‌پێی ڕاهێنانی منداڵه‌كه ده‌گۆڕێت .. به‌ڵام بۆ منداڵی له‌ڕو لاواز وه‌یا منداڵی ناكامڵ واته پێش كاتی خۆی له‌دایك بووبێت پێویستی به شیری زیاتر هه‌یه جا ئه‌گه‌ر بمانه‌وێ ئه‌م ڕاستیه بزانین دێین به‌راورد له نێوان دوو منداڵ ده‌كه‌ین كه هه‌ردووكیان له‌یه‌ك ته‌مه‌ندابن ، به‌ڵام یه‌كێكیان ناكامڵ بێت ئه‌وی تریان ته‌ندروستی باش بێت وه ئه‌م نموونه‌ی خواره‌وه ئه‌و ڕاستی‌یه ده‌رده‌خا ..

● نموونه :

منداڵێك گه‌ر ته‌مه‌نی شه‌ش مانگ بێت ئه‌وه ده‌بێ كێشی له حه‌وت كێلۆگرام كه‌متر نه‌بێت ، ئه‌مه‌یان له كاتێ كه ته‌ندروستی منداڵه‌كه باش بێت ، به‌ڵام ئه‌گه‌ر هاتوو له‌ڕو لاوازبوو وه كێشه‌كه‌ی 5 كیلۆگرام بێت ئه‌وه به‌م شێوه‌ی خواره‌وه شیری بۆ ئاماده ده‌كه‌ین :

7 كێلۆگرام × 165 سی‌سی = 1155 سی‌سی شیر بۆ له‌ش ساغه‌كه .

5 كێلۆگرام × 165 = 825 سی‌سی شیر بۆ ئه‌و منداڵه‌ی كه كێشی پێنج كێلۆگرامه .

واته ئه‌و شیره‌ی بۆ منداڵه له‌ڕو لاوازه‌كه پێویسته به‌م شێوه‌یه ده‌دوزرێته‌وه :

1155 + 825 ÷ = 990 سی‌سی شیر له ڕۆژێكدا پێویسته بدرێته منداڵه له‌ڕه‌كه كه كێشی پێنج كیلۆگرامه‌و ته‌مه‌نی شه‌ش مانگه .

● ئه‌و كاتانه‌ی شیر ده‌درێته منداڵ ●

دوای ئه‌وه‌ی بۆمان ڕوون بووه‌وه كه منداڵ له ماوه‌ی 24 سه‌عاتدا چه‌ند شیری پێویسته ، ئه‌وه به هاسانی ده‌ستنیشانی ژه‌می خواردنه‌وه‌كه‌ی بۆ ده‌كه‌ین ئه‌ویش به دابه‌ش‌كردنی شیره‌كه به‌سه‌ر سێ ژه‌م تا چوار ژه‌م ئه‌ویش به گوێره‌ی ته‌مه‌ن و ته‌ندروستی منداڵه‌كه ، ئه‌و منداڵانه‌ی كه ته‌ندروستیان باشه ئه‌وه پاش ته‌مه‌نی چوار مانگی چوار جار شیریان ده‌درێتێ ، به‌ڵام ئه‌و منداڵانه‌ی كه له‌ڕو لاوازن وه‌یا ته‌مه‌نیان له‌چوار مانگ كه‌متره نابێ ماوه‌ی ژه‌م‌و ژه‌م له دوو سه‌عات زیاتر بێت ، هه‌روه‌ها ده‌بێ شیره‌كه زۆر نه‌بێت .

● ئاودانه منداڵ ●

منداڵی تازه له‌دایك‌بوو ، وه به تایبه‌تی له‌مانگه گه‌رمه‌كانی هاویندا پێویسته زۆر ئاوی بدرێتێ له‌به‌ر ئه‌وه‌ی زیاتر پێویستی پێ‌یه‌تی ، چونكه جاری وا هه‌یه ئه‌و جۆره منداڵانه تووشی تایه‌كی زۆر گه‌رم دێت له ئه‌نجامی كه‌م ئاوی ، ئه‌و تایه‌ش پێ‌ی ده‌ڵێن تای بێ ئاوی ، گومانیش له‌وه‌دا نیه كه ئاو زۆر پێویسته بۆ ژیان‌و كارێكی چاك ده‌كاته سه‌ر شل‌و په‌یتی خوێن‌و میز هه‌روه‌ها كار ده‌كاته سه‌ر مێشك‌و گورچیله ، بۆیه ده‌بێ زوو زوو ئاو بدرێته منداڵ بۆ ئه‌وه‌ی زیاتر سوودی لێ‌وه‌ربگرێ ده‌بێ له یه‌كه‌م ڕۆژی له‌دایك بوونیا تاوه‌كو شه‌ش مانگ ئه‌و ئاوه‌ی ده‌یدرێتێ ئاوێكی ته‌عقیم‌كراو بێت واته كوڵاو بێت‌و سارد كرابێته‌وه بۆ ئه‌وه‌ی منداڵه‌كه تووشی هه‌وكردنی ڕیخۆڵه نه‌بێت .

## خوێنه‌ری ئازیزو خۆشه‌ویست .

دایكانی به‌ڕێز ئه‌م باسه‌ی ئه‌مجاره‌مان لێره‌دا كۆتایی‌ی دێ به‌و هیوایه‌ی له باسێكی تردا زیاتر بچینه نێو دونیای منداڵه‌وه‌و چاكتر له‌باره‌ی ژیان‌و ته‌ندروستی منداڵ بدوێین وه ده‌ستنیشانی ئه‌و جۆره نه‌خۆشیانه بكه‌ین كه توشی ده‌بن‌و چاره‌سه‌ریه‌كانیش بخه‌ینه ڕوو به‌و ئاواته‌ی كۆرپه‌كانمان هه‌میشه له ژیانێكی خۆش‌و به‌خته‌وه‌ردا بژین .

## سه‌رچاوه‌كان


1 — JAMES H . HUTCHISON

PRACTLCAL PEADIATRIC PROBLEMS Fifth edition

2 — VAUGHAN , McKAY , BEHRMAN , NELSON TEXTBOOK OF PEDIATRICS Eleventh Edition

3 — چه‌ند وانه‌یه‌ك له‌سه‌ر نه‌خۆشی منداڵان بۆ قوتابیانی پیشه‌یی ته‌ندروستی له پارێزگای هه‌ولێر له ساڵی 1980 — 1981 له لایه‌ن دوكتور سردار عبدالرحمن امین ، مامۆستای وانه‌ی نه‌خۆشی منداڵان به زمانی عاره‌بی پێشكه‌ش كراوه .



**ووریا ئەحمەد**

1984/4/15

مایەی شانازی‌یە بۆمان کە هونەری گۆرانی‌و مۆسیقای کوردیمان لەم چەند ساڵانەی دواییدا ماوەیەکی دوورو درێژی بڕی بەکاتێکی کورت (گەر بەراوردی بکەین لە گەڵ بەرەوپێش چوونی هونەری مۆسیقاو گۆرانی‌ی لای میللەتانی دیکە) ، وە هونەری گۆرانی‌و مۆسیقای کوردی توانی سەرنجی نەك هەر تەنیا کورد خۆی ، بەڵکو میللەتانی تریش بۆ خۆی ڕاکێشێ .

هەموو هونەر دۆستێك‌و نیشتمان پەروەرێك حەز دەکات ئەم بەرەو پێش چوونە بەردەوام بێت ، تا ئەو ڕۆژەی هونەری گۆرانی‌و مۆسیقامان دەگاتە عاستی هەمان هونەر لای گەلانی پێشکەوتوو لە جیهاندا ، بەڵکو لەوانیشی تێپەڕ دەکات ـ لاتان سەیر نەبێت کە دەڵێم لەوانیشی تێپەڕدەکات ـ چونکە میللەتی کورد وەکو بەڕێز دکتۆر (عز الدین مصطفى رسول) دەڵێ : گومان لەوەدا نەماوە کە نەتەوەی کورد لە فۆلکلۆردا یەکێکە لە نەتەوە هەرە دەوڵەمەندەکانی جیهان ..... هتد[1]

هەروەها زانایانی ڕۆژهەڵاتناس وەك : زانای ئەرمەنی (ئەبۆڤیان)و زانای بەناوبانگ (مار) و (مینۆرسکی) و (فاسیلی‌نیکیتین) و هی تریش دەربارەی فۆلکلۆری کورد گەلێك وتەیان هەیە کە شایانی تۆمار کردنن[2] . جا نەتەوەیەك کە خاوەنی ئەم هەموو گەنجینەیە بێت نەك هەر بەقسەی خۆی بەڵکو بە شایەتی زانایانی جیهانیش ، بەڕای من گوناحە گەر کارێکی وابکرێ بەقەد داوە موویەك ، کاری خراپ بکاتە سەر جوانی‌و بەرەوپێش چوونی خێرای ئەم هونەرە ڕەسەن‌و گەشەدارەمان .

چۆن‌و کەی گۆرانی کوردی سەرکەوتوو دەبێ ؟ ؟

جارێ تازووە هەوڵ ئەوە بدەین زووربەی گۆرانی‌یە فۆلکلۆریە کانمان (ئەوانەی شیاوی تۆمار کردنن) تۆماربکەین ، بە مەرجێك کە بە هیچ جۆرێك دەسکاری هەڵبەست‌و ئاوازەکان نەکەین .

.... کاتێك ئێمە ئەوماف دەسکاری شیعر یا ئاوازی فۆلکلۆری دەدەین بەخۆمان ، کە توانیمان ئاوازو هەڵبەستە بنەڕەتیە ڕەسەنەکە بەچاپ بگەیەنین و لەوون بوون ڕزگاری بکەین[1] . چونکە گۆرانیی فۆلکلۆری هەر هی میللەت خۆیەتی ، مۆرکی نەتەوایەتی لە باوك و باپیرانەوە دەگوازێتەوە بۆ نەوەی تازەمان ، جا کە گوێی نەوەی ئەمڕۆ (مەبەستم منداڵی کوردە) بە گۆرانی کۆنی کوردی ڕەسەن ئاودرا ،

دیمەنی گەشەسەندن و ڕازاوەی هونەری مۆسیقاو گۆرانی کوردی دوا ڕۆژمان دێتە بەرچاو . ئێمە زەمینەیەکمان بۆ ماوەتەوە لە کەڵە گۆرانی بێژە نەمرەکانمان وەك (سەعید ئاغای جەزراوی ، کاویس ئاغا ، مریم خان ، (سەید عەلی ئەسغەری کوردستانی) - عەلی جەزراوی - عەلیکۆ - سێوە - مەلا کەریم - حسن زیرەك ، عەلی مەردان .... هتد . بە هۆی ئەم زەمینەیەوەو پشکنین و بەدوا گەڕان و سووڕان لای کەسانێك کە بە هەڵگری گۆرانی فۆلکلۆریمان بەناوبانگن بەتایبەتی لە گوندو شارە کچکەکان ، کەیشتینە بارێکی باشتر لە گۆرانی و مۆسیقای کوردیمان ، جا پێویستی سەر شانی هەموو هونەرمەندێکی کوردە هەوڵی ئەوە بدات ئەو زەمینەیە فراوانتر بکات بۆ نەوەی داهاتوو تاوەکوو بینای جوانترو بەرزترو لەبارتری لەسەر دروست بکەن .

تیپی مۆسیقای سلێمانی - تیپی هونەری هەولێر - تیپی باواجی - تیپی دهۆك .. ئەم تیپانە بە شایەتی هەموولایەك باشترین هونەرمەندانی کوردیان بەخۆیانەوە گرتووە ، لەگەڵ ئەوەشدا کە هەندێ لە هونەرمەندانی ئەم تیپانە ، توانای ئەوەیان هەیە چەندین ئاوازی تازە دابنێن و داشیان ناوە ، بەلام وەکو سەیر دەکەین زووربەی بەرهەمی ئەم تیپانە - فۆلکلۆرین - جا با لە خۆمان بپرسین بۆ ؟؟؟؟ .... چونکە ئێمە تاوەکو ساڵەکانی حەفتاو دەورووبەری گوێمان زیاتر لە هونەری گۆرانی و مۆسیقای میللەتی دراوسێ دەبوو لەوەی لە هونەری گۆرانی و مۆسیقای خۆمان بۆیە بەڕای من هەر ئاوازدانەرێك و شاعیرێك و گۆرانی بێژێکی ئەمڕۆی کورد ، پێویستە ئاگاداری تەواوی هونەرو ئەدەبی ڕەسەنی کوردی بن و شارەزایی تەواویان هەبێت لە کێش و جۆرو مەقام و سۆزی گۆرانی فۆلکلۆریمان وە ئاگاداری هەموو بەرهەمی کەڵە شاعیرەکانمان بن لە کۆن و نوێ ، بۆ ئەوەی ئەم جۆرو کێش و تام و مۆرکی نەتەوایەتی یە هەرگیز لەدەست نەدەین هەروەك مۆسیقاری بەناوبانگی ئەرمەنی (خاچادۆریان) دەڵێ :- پێش ئەوەی مۆسیقا جیهانی بێت ، پێویستە نەتەوەیی بێت - ، شاعیر هەوڵ بدات (شیعری گۆرانی) بەووشەی سادەو قسەی ناو زووربەی خەڵکی زەحمەتکێش دابڕێژێ و لەهەمان کاتیشدا ڕەنگدانەوەی واقیعی ژیانی زووربەی میللەت بێت .

بەداخەوە دەڵێم - گۆرانی لای هەندێك بووە بە بازرگانی ، کۆڕی خاوەن پارەو دەسەلاتی پێ گەرم دەکرێت ، لای هەندێکی تربووە بەخۆ پیشان دان و ناو دەرکردن . لێرەدا دەڵێم :-

تاکەی پێشێل کردنی زەوق و هەستی خەڵکی بێ تاوان ؟ ! ؟ !

نابێ ئەوەشمان لەبیر بچێت - بەردەوام بوونی ئەو کەسانە لە کارە ناڕەواکەیان ، کارەساتێکی ترسناکە ، دەبێتە هۆی ئیفلیج بوونی گۆرانی و مۆسیقای کوردیمان[2] .

جا بۆ ئەم جۆرە کەسانە دەڵێم - هونەر زۆر پیرۆزە هونەر کارێکی زەحمەتە - شەونخونی یە - خوێندنە - کوڵنەدانە - ئارەقە ڕشتنە ، خزمەت و فێرکردن و بەرەوپێش بردنی عاستی (باری ژیانی خەڵکی زەحمەتکێشی ناو کۆمەڵگای کوردەواریمانە) ، نەك بەرژەوەندی خ‍ـان و هیچی تر .

سەرچاوەکان :


1 ئەدەبی فۆلکلۆری کوردی - دوکتۆر عیززەدین مستەفا ڕەسووڵ
2 هەمان سەرچاوە - دوکتۆر عیززەدین مستەفا ڕەسووڵ
3 في اصول الموسيقى الفولكلورية بقلم (اسعد محمد علي)
4 بلاوکراوەی «القيثارة» مجموعة الأعداد السنة الاولى .

لە بەرهەمی لاوان

# بزێو


بكر محمد أمين

هەولێر 1983/7/26


کیژی ناسك ...
بریا هەرگیز ، نیگای وێڵی بێ ئامانم
جێ نزرگەی تۆ نەبوایە
وەکو مەلی ناو هێلانە
لە زەمینەی چاوەکانم دوور بوویتایە

* * *

ماڵ ئاوەدان ، وەکو دیمیت
بۆچی هێشتت .. ! ؟
زام و ژانی ڕۆژانی زوو
لەیەك ساتا
مەی نۆش ئاسا
بخۆمەوە لە چاوانتا

* * *

بێ بەلایی ...
هەنگاوی شێواو و شەرمنم
وای لێ کردم عیشق و نەشتەر ،
لەبری خامە
بخەمە دووتوێی پەنجەوە
بەسوژنی ئاگراویش
لەسەر دڵە تەوەلاکەم
سیمای جوانت بکێشمەوە

* * *

کچێ نازێ ...
هەر نیگایەکت پڕ ڕازێ
لەوەزیاتر هیچی دیکەم لەدەست نایێ
ئەم جارەیان ، چیم لێ دەکەی
سواری کۆڵی چ ئەسپێکی شێتم دەکەی
بۆ کوێم دەبەی
بۆ کوێم دەبەی

# بارانی گوڵ


نازەنین

کەرکووك/ نیسانی/1983


ئازیزەکەم
ئاسوودەی دڵە زیزەکەم
تۆ دەزانی
هەرچی هۆش و هەست وبیرە
بەکۆتی عەشقت یەخسیرە
کە دەت بینم لەسەر ڕێگا
لەسەر هەر شوستەو شەقامێ
لەناو دڵی لەت و پەتا
جێ خۆش دەکەی
بۆ شێر پەنجەی

ئاسووری ، ئاگری ، زامێ
کە دەت بینم و ناتکەمێ
کە مارووی گشت گیانم دەدا
لەشکری هۆلاکۆی خەمێ
بگرە بۆ خۆشم نازانم
چیم بە سەر دێ
خۆ شاعیرنیم بۆت هەلڕێژم
لەو ساتانە بۆ کێ دەبێ
تاعەتم ، ڕۆژیم ، نوێژم

ئازیزەکەم
ئاسوودەی دڵە زیزەکەم
من هەر ئەوەم
کوڕەبێ نازەکەی جاران
کە بۆ تاکە ژوانێکی پڕ خۆزگەدا
دەمدایە بەر
ڕێگەی سەختی شەستەباران
پشتم لەکۆگاو شەقامی نێو شار دەکرد
بە تروسکەی مۆمی هیوات
جەرگی شەوم شەقار دەکرد
نەدرکەزی
نەداوی ووردی مەرگەوەڕ
تیشکی چاوی گومی نەوتیان
بەهیچ جۆرێ نەخست لەگەڕ
ئازیزەکەم
تەسکینی دڵە زیزەکەم
هەتا زووە
هەتا چناری عەشقی تۆ
بۆ لووتکەی ئاسمان هەڵچووە
وەك ڕێبواری کفت و شەکەت
لە باوەشی مانگی مەندا
بەجووت سەر خەوێ بشکێنین
لەبلند گۆی شانۆی ئەم شوێنە بەرزەوە
گۆمی کڕی هەموو جیهان
بشلەقێنین
بەسەر کێڵگەو مەزاری زەردا
بارانی گوڵ
ببارێنین



بـزانـن تـیـلەی چ چـاوە ! بـازێ ؟
چ لەنـجـەو لارێ ، چ خـاوەن نـازێ

لێم بـوتـە قـیـبـلە ، قـیـبـلەی گـۆڕیـووم
دڵی لێ سـەنـدووم ، هـۆشی بـڕیـووم

هـەرکـە جـوانـێ دێ وا تـێی ئـەڕوانـم !
زۆر بـە دڵسـۆزو دۆسـتـی ئـەزانـم

هـەرچـەنـد جـوانیش بـوو ژینی تـاڵ کـردم
لە بـەزمـی ژیـان ڕەنـگـی ئـاڵ کـردم

چـی لەدڵ بـکـەم ئـارەزووی ژوانـە
عـاشـق بـە خـەنـدەی لێـوی یـارانـە

پێم خـۆشـە هـەرگـیـز قـەت لێم دوور نـەبن
دەسـتـەی چـاو جـوانـان لێم دڵ زیـز نـەبن

● خلیل یاسین هۆشمەند ●

# دوو نامەی جیاواز

نەوزاد عەلی

## پەیمان

تاکەی ... تاکەی ؟
ئەم دەست ئەم دەستم پێ دەکەی
لەم کاروانە ، مەستم دەکەی
وەکو منداڵ ، پەستم دەکەی
جارێکی تر ، پەیمان بدە
بە دڵەی بەندە ...

## ئارەزوو

حەزم دەکرد
ووشەیەکی نەرمو نۆڵت بۆ بنێرم
ڕاسپاردەکەی
مرۆڤێکی ئەم سەردەمەت پێ بسپێرم
زەماوەندی چەندان ساڵەی ،
چاوەڕێکراو ، بۆت بگێڕم ..
بەڵام گیانە
ببوورە لێم
لە نامەکەت ، پرسیار بکە ئێستا لە کوێم

# سەرسامی

● بەندی عەلی ●

کـە ژیـانـم پـایـیـزێـکـی هـەمـیـشـەبـێ
کـە فـوغـانو حـەسـرەتو زارم پـیـشـەبـێ
کـەمـن ویـڵو ئـاوارەبـم لە نـێـو کـێـوان
بـزەو خـەنـدە بـۆچـی بـڕوێـن لەسـەر لێـوان
کـە زامو ژان هـاوڕێی هـەمـوو کـاتـێـکـم بـن
شـادی سـەفـاو ڕابـواردنـم بـۆچـی‌یـە مـن

کـە بـێ‌بـەش‌بـم لە ژیـانـی ڕاسـتـە قـیـنـەم
بـۆچـی دەرنـەکـەم ئـەم دڵە پـڕ لە قـیـنـەم
کـە ئـارەزووم غـەرقـی دەریـای خـەیـاڵات بـێ
بـۆچی‌مـە ، مـەی ، کـە دائم مـەستیم خـەڵات بێ
نـە دڵدارم ، نـەبـێ دڵـم ، نـە فـریـشـتـەم
نـە خـەریکی سیحـرو جـادوو فـێـڵو نـووشتـەم
مـرۆڤێکم مـەستو سـەرسـام ، ویـڵو حـەیـران
لەتـاو داوی بـێـیـەکـسـانـی ڕەشی ژیـان
هـەنگـاو ئـەنێم ، هـەنگـاوی ویـڵو کـوێـرانـە
دڵ بـڕاوە ، هـەسـت نـەمـاوە ، مـاڵ وێـرانـە
ئـەم ژیـانـە تـێـکـەڵاوە ، هـەنـدێ بـێـبـەش
کـوێـرەوەری مـیـوانـیـتـی ، چـارەنـووس ڕەش
هـەنـدێ شـادو بـەخـتـەوەرن ، یـان بێ ئـاگـان
یـان بـە ئـاگـان لەژێر نـمـەی سـووکـە بـاران




صباح عبدالرحمن

لەپێناوی چەسپاندنی ڕەگو ڕیشەیەکی زانیاریانەو ڕاست بۆ دواڕۆژی شانۆی کوردی ، پێویستە لەزۆر لایەن بیربکرێتەوە . یەکێك لەم لایەنانەش ... بوونی دەقی شانۆگەری منداڵان هەروەها دروستکردنی منداڵی شانۆگەری ... بەمانای خاڵو توکل .. خاك پیرۆزە پێویستە تۆکلەکەش چاكو ڕەسەن بێت ... ئینجا بێگومان بەرهەمەکە دارێکی شەنگ دەبێت ... بەرێکی پڕلەسوود دەبەخشێ .

ئەم دوو کورتە شانۆگەرییە پێشکەشە بەو کەسانەی کەتیشکی ئاواتە خوازی دوا ڕۆژێکی گەش شانۆی کوردی بەوانەوە بەندە بۆ منداڵان

## شوێن

میرگێکی سەوز لەناو باخێکدا کە دەورو بەری بەزنجیرەی شاخێك گیراوە ... دار گوێزێك لەناوەڕاستی دواوەی شانۆیە ... لەقەد بەردێکی گەورە ڕواوە ... کات بەرەبەیانێکی بەهار عەرز ڕازاوەتەوە بەگوڵی ڕەنگاوڕەنگ ...
[ئەم شانۆگەرییە بۆ منداڵان نووسراوەتەوە]

### کەسانی شانۆگەرییەکە

1 - شوان
2 - دوکار
3 - دوو بەرخۆلە
4 - دوو چۆلەکە
5 - دوو بولبول
6 - هەنگ
7 - پەپوولە
8 - کوندە پەپوو
9 - بنەدار
10 - ڕۆژ

**شوان** :
ئەی بەرخۆلەی چاو ڕەشم
ڕاکە بۆ ناو باوەشم
تۆش ئەی کارە جوانی خۆم
وەرە بباعێنە بۆم

**کارو بەرخۆلە** :
پرسیارێکت لێدەکەین
ئەی شوانی ئازاو شەنگ
کوا چریکەی بولبولان
کوا سەمای پەپوولەو هەنگ
مێرگ ئیمرۆ وا کز دیارە
وەك بڵێی شتێکی لەبارە

**شوان** :
ڕاستدەکەن شتێك ڕویداوە
بۆیە واغەمگین دیارە ئەم ناوە
[پەپوولەو هەنگ بە کزو غەمگینی دەردەکەون]

**شوان :**
هـاورێـکـانـم پـەپـوولەو هـەنـگ
بـۆ رائـەبـرن کـزو بـێدەنـگ
هـەستنـەکـەم کـە گـوڕاون
ڕوو قـسـە خـۆشی نـەمـاوە

**هەنگ :**
کـاکـی شـوان ڕوویـدا کـارەسـات
هـانـامـان کـەوەو بمـاندە نـەجـات

**پەپوولە :**
بـولبولی دەنـگ خـۆشیو چـۆلەکـەی جـوان
نـاویـرن دەنـگ هـەڵبـڕن لەتـرسـان

**کارو بەرخۆلە :**
ئـێـمـە زانـیـمـان شـتـێـك ڕوویـداوە
بـۆیـە واغـەمـگـین دیـارە ئـەم نـاوە

**شوان :** تێم بگەینن چی ڕوویداوە ... ؟

**هەنگو پەپوولە :**
هـەیڕۆ هـەیڕۆ کـونـدەپـەپـوولەم نـاوە
هـەیڕۆ هـەیڕۆ هـێـلانـەی خـۆی دانـاوە

**شوان :** گوێبگرن .. برۆن ئاگاداری هاورێکانتان بکەن تا بێن بۆنەوەی پلانێك بۆ ئەم کارە دابنێن

**هەنگو پەپوولە :**
بـە چـاوان هـەر ئـێـسـتـاکـە
بـە چـاوان هـەر ئـێـسـتـاکـە

**[ئەچنە دەرەوە]**

[دوور بەدووری دەنگی کوندەپەپوو دێت]

**کارو بەرخۆلە :**
کـونـدەپـەپـووی شـووم دوژمـنـی ئـاوەدانـی
شـەوو ڕۆژ ئـاواتـەخـوازە بـۆ تێکـدانـو ویـرانی

**بولبولو چۆلەکە :** [دەردەکەون]
بـرای شـوان هـاوڕێی ژیـان
ڕزگـارمـانکـە لە ئـێشو ژان

**شوان**
مـۆڵەتـمدەن بـیـرکـەمـەوە
تـا ڕێـگـایـەك بـدۆزمـەوە
ها ... ؟ دەڵێنچی ئەم بنەدارەی کوندەپەپوو لەسەر نیشتووە بشکێنین ... یا بیسوتێنین ...
بەم جورە کوندەپەپوو ناچاردەکەین بڕواتنو دەیفەوتێنین

**بنەدار :** [دێتە قسەکردن]
هـاوڕێکانم ... هـەر لەم ڕۆژەی بەنـاسینتان ئـاشنا بـوویمە هاوڕێتانم مەمسوتێنن لەپێناوی کوندەپەپوو من بێ زیانم

**هەموو :**
راستدەکات بنەدار گوێز ئاشنامانە چاکەی سێبەرو بەری خۆشی لەسەرمانە

**ڕۆژ :** [دێتە قسە]
مـن هـەسـتدەکـەم ئـێـوە دڵسـۆزی یـەکـەن
بـۆ بـەرگـری لە ڕووی دوژمن بـاشتـریـن چـەکن
بـڕیـارمدا بـەگـەرمـایی خـۆم یـارمـەتیتـاندەم
گـەڵای دار گـویـز وشـك دەکـەم
کـونـدەپـەپـوو بـەد کـویـر دەکـەم

**بنەدار :**
مـن ئـامـادەم ئـارام بـگـرم لەپـێـنـاوی ئـێـوەدا
ڕزگـار بێتن مـێـرگـی جـوان لە کـونـدەپـەپـووی بـەدا

[ڕۆژ تیشکی ئەداتە دارەکەو ووردە ووردە گەڵاکان دەکەون]

**کوندەپەپوو :** [هاوار دەکات]
تکاتان لێدەکەم ڕێگام بدەن من دەڕۆم ...

**هەموو :** بڕۆ بڕۆ ... ئەم ئاواییە بەجێ بهێڵە ..

ئەكتەران :

1 - شاعیر بەجلو بەرگی یونانییە
2 - خانی «پیرەمیر»
3 - حەسەنو حەمو دو برانەو لاڤژە بێژن
4 - مەم
5 - لاس
6 - گینج خەلیل      دەرهێنەر ئەتوانێ بە یەك
7 - فەرهاد      یان دو ئەكتەر جێگای هەمویان
8 - چەتو      وەرگری

1 - شیرین
2 - زین      دیسان بە دڵی دەرهێنەر ئەتوانێ
3 - حەفسەد      یەك كچ ئەو دەورانە ببینێ
4 - خەزال
ژمارە 1
ژمارە 2      خەڵكن
ژمارە 3
چیروك بێژ .

- تابلوی یەكەم -

چیروك بێژ لە ناو هۆڵدا هەڵدەستێتو دەست بە گوتنی لاوك دەكا پاش كوژاندنەوەو رەوشەنكردنی توندی روناهی لە ناو شانۆدا ... دەنگی بڵندی موسیقا وەك تریشقەی هەور دێت ... روناكیەك بە دوای چیروكبێژەوە دەچێت لە ناو هۆڵدا تا دەگاتە سەر شانۆ :

**چیروك بێژ** : دەلوو لوو دە لوو لوو دەلوو لوو
دەلوو لوو دەلوو لوو دەلوو لوو
دلێ من و خوش لیانە
ئەز ل هێلێنین چیچك و كەوا د گەریام
هیڤیا من دیتن و ڤیانە
ڤیان چییە و بوچی بییە
ل كی جیهییەو چ نیشانە

«لە كاتی دەگاتە سەر شانو بە شەپرزەیی تە ماشای دانیشتوان دەكا هەر وەك نەیدیبین .. روناكی هەر بە دوایەتی هیچیتر لە

**كوندەپەپوو** :
بە تیشكی رۆژ زۆر پەستم
تاریكیو شەو ئەپەرستم

[لەگەل هاتنەخوارەوەی چاوی نابینێتو خۆی ئەدا بە عەرزا]

**شوان** : [ئەگاتە سەر كەلەشەكەیو گۆچانەكەیو قاچێك ئەخاتە سەر سەری كوندەپەپوو]

**هاورێكانم** :
كوندەپەپوو خۆیدا بە عەرزاو مرد
سوپاس بۆ رۆژ لە ئاسمانا ئێمەی رزگاركرد

**پەپوولەو هەنگ** :
كەواتە بەم بۆنەوە كە بنەدار ئارامی گرت بەرامبەر گەرمایی رۆژ پێویستە ئاهەنگێكی گۆرانی بۆ بنەدار خەلات بكەین ...
هەموولایەك دەستدەكەن بەسەما كردن لەسەر ئاوازی مۆسیقاو دەنگی بولبول ، جریوەی چۆلەكەو ، باعە باعی كارو بەرخۆلان ...
پەپوو لە سەماكەری سەرەكییە
هەنگ خۆشاوی هەنگوین دابەش دەكات

**هەور** :
(دەنگدەداتەوە لە ئاسمانا)
ئەی ئەوانەی كە دلسۆزن بۆ پاراستنی هێمنی ژیان
لەمنیشەوە خەلات بۆ ئێوەی بەرێز بروسكو باران
تا دووبارە دارگوێز گەلای سەوز بگرێتەوە
تا دووبارە بەهاری ژیان نوێ بێتەوە

**هەموو** : هەتا هەتایێ بەدو ناپەسند لەناواییمان دووركەوێتەوە .

* سوودم لە چەند پارچە شیعرێكی (كاكەی فەلاح) وەرگرتووە .

# بیلەو دیاری

ناو شانودا پیشان نادا بەو شەپرزەیی یە دەست بە ئـاخوتن دەکا .

**چیروك بێژ** : ئازیزان .. لێم ببورن ... ئاگام لە ئەنگونەبو هەر وەهـا ئاگـام لە خوشم نـەبو ... لە بـەر ئەوە بمبـەخشن .. دانیشتوانی بەرێز پرسیارەکم هەیـە .. ئەو پـرسیارە کـونەو ئێستاش دوبارەی دەکەمەوە :ـ ڤیان چی‌یە .. ؟ دوستی ... حوب ... لەڤ ... خوشەویستی چنە .. ؟ زور کەس لە پێش من و لە گەڵ من داو لە پاش منیش هەر بیر لەو شتە دەکەنەوەو لە دوای وڵامی ئەم پرسیارە دەگەرێن ... من بەش بە حاڵی خوم زور وڵامم دوزینەوە .. گەورەکـان ... پاڵەوانـەکان هـەژارو بەلەنگازەکان .. ئاغاو کوێلەکان .. ژن و پیاوەکـان .. پربیـژو شێتەکان ... مـەردو نامـەردەکان .. هـەر یەك بـە ئارەزوی دڵخوشبونی خوی وڵامی داوەتەوە .. جا من دەلێم ڤیان ئـەو شتەیە دڵ بتـەبێنێو هەلپـەرینێ ... خوشی زورکـا ... کین و تورەیی لە دڵ دەرکا ... لە هەموو توخیبەکان دەربچێ .. لە ناو بازنەیەکی تەنگ نەمینێ ... بەلکو لە کوشی خوی‌دا جێی هەموو شتێ بکا تەوە ... زوری لە سەر رڵیشتم ... لە بیرم چو شتە گرینگەکەتان بو بگێرمـەوە .. چیرۆکـەکە ... ئـەو چیروکـەی ئەمانەوێ ئیمشەو پێشکەشی بەریزتان بکەین .. ئەم چیروکە هیچ چیروکنوسێك نەی‌نوسیوەو هیچ حیکایەت‌خان نەی گوتوەو لە هیـچ کتێب‌و دەفتەردا چـاپ نەکـراوە ... لێم ببـوورن ... بمبەخشن .. من هەر وامە .. پربێژم زور قسەدەکەم ... بەلام ها ... وا دەچمە ناو جەرگی چیروکەکەوە ... ئازیزەکان ... لە کـونەوە ... شـاعیـرەك هـەبـو کـە ئێستـاش مـاوەو هـەر دەشمینێ ... خدری زیندەیـە .. شتی‌ترە نـازانم ... ئەویش وەك ئێستای من هەر ئەو پرسیارە دەکا ... ڤیان چی‌یە .. ؟ لە هەموو کـون‌و قوشبنی ئـەم جیهانـەدا گەراوە ... ڤینـوس‌و عەشتاری دیوە ... لە گەل منیرڤاو ناهید دانیشتوەو ئاخوتنی لەگەل ئاهورەمەزداو ئـەهریمـەن کردوە ... چـەند پـالەوانی عیشق لەم دونیایەدا هەبون‌و نەبون لێ‌ی پرسیون‌و کەوتوتـە گفت‌و گو لە گەلیاندا ... هیچ یارو ئەڤیندارو پەهلەوانی ڤیانی نەهیشتوتەوە .. بەلای هەموویاندا رۆیشتوە .. بە ناو هەموو میللەتانی جیهاندا تێپەریوە .. ئەو میللەتانەی ماون‌و نەماون تا لە دواهی‌دا گەیشتوتە جێگایەك دیویەتی کەنجـەکانیـان زور کەشخەو قوزن‌و کچەکـانیان جـلی رەنگاو رەنـگ دەپوشن .. پیرەکانیـان عاشقی شیعـرو شایـن .. هەمـوویان عـاشیق‌و ئەڤینداری خاکن ... زور حەز لە گـوڵ‌و شتی رەنگاو رەنـگ دەکەن ... شایی‌یەکیان هـەیە پێ‌ی دەلێن : رەشبـەلەك ... کچ‌و کور ... پیرو گەنج ریز دەبن‌و دەکەونە هەلپەرین لە سەر ئاوازی دوول‌و زورنا یان ستران‌و گورانی گوتن ... خاکیان پر چیاو دۆڵ‌و روبارو کانی ئاوی سارە ... خاکیان پر زێرو خێرو هاتە ... مێرگیان پر نێرگزو هەلالەو رێواسن ... چیایەکانیـان پرن لە تەیرو ئاژەلی کێوی ... لە قەراخ شـارا پیرەمێـردەکی دیوەو لێ‌ی پرسیوە : ئەوە چێ میللەتەکن‌و ئەو خـاکە نـاوی چی‌یە .. ؟ پیرەمێردەکە وڵامی دایەوەو گوتی : ئەم میللەتە کە لەو بەهشتە زەمینەدا دەژین ناویان کوردە .

«ئەو روناکی‌یەی چیروك بێژی نیشان دەدا بلاودەبێتەوە نـاو شانو شاعیر و پیرەمێرد دیاردەکا و چیروك‌بێژ بەرز دەبێ ...»

شـاعیر گـەنجەو جـل‌و بەرگی یـونانیـەکانی کـونی لە بەردایە ... پیرەمێرد ژی بە جل‌و بەرگی کوردی‌و گوجانەکی بە دەستەوەیە وەکو شوان دیارە ...»

**شاعیر** : من جێگای وام بەرچاو نەکەوتوە
لە مێژودا ناوی وام نەبیستوە

**پیرەمێرد** : رولە ئەمانە میللەتی چیانە
نەوەی کاردوخ‌و گەلی میدیانە
هونەری گەورەی ئەوان ڤیانە

**شاعیر** : ڤیان ... ! .. ڤیان ... !! ؟

**پیرەمێرد** : بەلێ .. رولە .. بەلی ڤیان .. !!

**شاعیر** : مامه گیان له کۆنه‌وه تا ئێستا
له ڤیان ده‌گه‌ڕێم پەیتا پەیتا
لاپه‌ری مێژوم نه‌هێشتوه .. نه‌ی پشکنم
قوشبنی جیهانم نه‌هێلاوه .. تێی نه‌گه‌ڕێم
هه‌ر جێگا خوشه‌ویستی تێدا بوبێ
بومه مێوانیان گه‌ر ده‌وزه‌خ ژی بێ
به‌لام ئه‌نگۆ ناناسم
**پیره‌مێرد** : کوڕم بڕو ب بینه
له دوڵ و چیا ... دار و دره‌ختان .. بپرسه
ل ناو جادده‌و کولانان
له زویرو بنارو مێرگان
له سه‌ر روبارو کانیان
له باو باران بپرسه
**شاعیر** : مامه گیان ... چی بپرسم
من ئه‌زمانیان نازانم
**پیره‌مێرد** : چون له ڤیان ده‌گه‌ڕێی و نازانی .. !
ئه‌زمانی ڤیان که‌س هه‌یه نه‌یزانی .. ؟
به هه‌ر ئه‌زمان بو ڤیان بێژی
هه‌موو که‌س وەك یه‌ك تامی ده‌چێژی
**شاعیر** : مامه گیان وه‌یه ... له بیرم چو بو
زمانی ڤیان یه‌که‌و نابێ به دوو
**پیره‌مێرد** : کوڕم پێم بلێ تو کێی
کێوه ده‌چی و له چی ده‌گه‌ڕێی ... ؟
**شاعیر** : مامه گیان من شاعیرم هوزانڤانم
ده‌گه‌ڕێم و چاوه‌ڕێی ئاموکوڤانم
ل ده‌رونی ئه‌ڤینداران هه‌ڵقولاوم
به ئاموناڵی عاشیقان ناسراوم
گه‌رانی من له دوای ئه‌کسیری ژیانه
ئاواتی من هه‌میشه دوزینه‌وه‌ی ڤیانه
**پیره‌مێرد** : کوڕم ... گه‌ر شاعیرو هوزانڤانی
گه‌رگه‌روکی و ئه‌ڤینداری دلوڤانی
به سه‌ر باڵی ته‌یر ده‌گه‌ڕێی و ناته‌بتی
بو ڤیان هه‌وڵ ده‌ده‌ی و ناراوه‌ستی
وه‌ره ب بینه کوردی هه‌ژارو به‌له‌نگاز
بو مه‌به‌ستی ڤیان ده‌گه‌ڕێ و

به دڵ و به گیان ... هه‌ر ده‌کا گازه گاز
**شاعیر** : تو خوا مامه ... ئه‌نگونه خاوه‌ن ڤیان
زور ده‌مه ده‌گه‌ڕێم و نه‌مدیبو نیشان
**پیره‌مێرد** : ئه‌تو گه‌نجی و ... ده‌ڵێی هاوده‌می مێژوی
گه‌ر عیشتارت دیبێ ... بو چی پیر نه‌بوی
**شاعیر** : مامه گیان ... ئه‌وی ڤیانی له دڵ دابێ
ژیانی بو ڤیان ته‌رخان کرابێ
نه ده‌که‌وێ و نه پیر ده‌بێ
**پیره‌مێرد** : ئێستا تو چیت ده‌وێ له من .. ؟
**شاعیر** : لاپه‌ره‌کی ڤیانی ئه‌نگوم ده‌وێ ... !
**پیره‌مێرد** : وه‌ره لاپه‌ری مێژومان وه‌رگێره
چاوێ له پاڵه‌وانه‌کانی عیشق بگێره
لاس و خه‌زال ... مه‌م و زین
ستی و فه‌رخ ... فه‌رهادو شیرین
قاسمێ مه‌یرو ... مه‌حه‌مه‌دو سێوێ
چه‌توو یاره‌که‌ی ... جه‌مبه‌لی و بنه‌وشێ
هه‌مویان ئه‌ستێره‌ی ڤیانن لێره
**شاعیر** : شاعیرتان نی‌یه بیان نه‌خشێنێ
به دونیایان بناسێنێ
**پیره‌مێرد** : چیروکی شاعیرمان ده‌مێنته‌وه
باب بو کور ده‌ڵێته‌وه
کور بو نه‌وه ده‌گێرته‌وه
**شاعیر** : مامه گیان پێم بلێ تو کێی و ناوت چی‌یه
له‌و هه‌موو گوتانه مه‌به‌ستت چی‌یه
**پیره‌مێرد** : کوڕم ... ئه‌زم دلسوزی ئه‌وانه ... خانی
چیرۆکی مه‌م و زینم بو ئه‌وان ئانی
**شاعیر** : مامه گیان ... که تو خانی شاعیری
چون نه‌مای به گه‌نج و ئێستاکه پیری
ئه‌وه‌ی شیعرو ڤیان له دڵدا بێ
هه‌رگیز نامرێ و هیچ جار پیر نابێ
**پیره‌مێرد** : گه‌ر کاره‌ساتی ئێمه ببیستی
نه‌ك پیر ده‌بی به‌ڵکو ده‌هێنی نوشوستی
«له کاتی ئاخوتن‌دا پیره‌مێرد ئیشاره‌تی بو دانیشتوانی ناو هولدا ده‌کا ...»
**شاعیر** : گه‌ر من بڕومه ناو ئه‌وانه

کێ بگرم بو خوم بە نیشانە
**پیرەمێرد** : کورم ... هەر کەسێ ببینی بە چاو
لە منال و پیرو ژن و پیاو
دلیان تەپە تەپ دەکا ... بوڤیان .
«روناکی کز دەبێ و هەمو شانو تاریک دەبێ»

**- تابلوی دوەم -**

«چیروك بێژ دێتەوە سەر شانوو گورانی دەلێت»
**چیروك بێژ** : ئەزێ ب گوندێ مەدا بیمو بەر لە کانی
گول و نەسرینا شانێت خو جەم یەك دانی
دەنگێ حەسەن و حەمویا بێ دهێتن
یەکەك دەنالی و یەکەك چیروکی ڤیان دەلێتن
ئازیزەکان لێم بوورن ... سەرتان نەئێشینم ... من پر بێژم ... زۆر ئاخوتن دەکەم ... بەلام قسەکانم بێسود نینە ... شاعیری کۆنە پوش و گەروکتان دی ... چەند باسەکی پر قازانجی لە گەل پیرەمێردی کرد ... وابزانم ئەنکوژی شتێکتان لێ‌ی قازانج کرد ... ئا ... ئا ... من لە گورانی گوتنمدا باسی دوو ناوم‌کرد ... حەسەن و حەمو ... ئەوانە دوو پیاو بوینە لە کاتێکی زووە ژیاون ... هەر وەك باسیان دەکەن ... ناویان هەسن و مەمو بوینە کە چی پاش دیار بوونی ئیسلام کراون بە حەسەن و حەمو ... تا چێ رادەیەك ئەوە راستە ... ؟ ئەوەی نازانم ... بەلام ئەوەی دەگێرنەوەو دەلێن ئەمانە دوو برا بوینە ... لە منالی‌یەوە خەریکی رابواردن و پێکەنین و شادی بوینە .. دەلێن نازانم ئەو دەلێنە راستە یا درویە .. هەر دوکیان خەونێك دەبینن کە شەلخەی مێش هەنگوینەك لە دەمیان دەردەپەرێ ، پاشان دەچنە لای مەلایەك یا زانایەك بو ئەوەی خەونیان بو شی‌بکاتەوە ئەویش پێیان دەلێ : ئەنکو دەبنە شاعیرو لاوك بێژ ... لە پاشان بوون بە لاوك‌بێژو شاعیر ... هەر چیروکەك گوێیان لێ بوبێ دەیان کرد بە بەیت و مەلحەمە ... بەلام ئایا ئەو هەر دوو کەسانە راستەقینەن یا ئەفسانەیین .. ئەوەی نازانم ... هەر ئەوەیندە دەزانم کە ئەو هەموو کەلەتورو توراسەی هەمانە چ لاوك و بەیت یا مەلحەمەو ستران هەموی بو ئەو دوو کەسەی دەگێرنەوە !
«چیروك بێژ دەچێ و شانو روناك دەبێ و دوو کەس لە ناو شانودا هات و چون دەکەن :
**یەکەم** : هەسن وەرە من برسی‌مە ... !
**دوەم** : مەمو چی بکەین ... ؟ چی بخوین .. ؟ منیش وەك تو برسی‌مە .. !
**هەسن** : دەچینە جێگایەك ... بەلکو تشتەکمان پێ‌بدەن !
**مەمو** : کورە بەخوا پێمان نادەن
گەر بشیدەن .. ئەوە لە ئەزمانمان دەترسن .. !
**هەسن** : ئەوەش هەر باشە لێمان بترسن
**مەمو** : ئێستا تو بلێ‌ی وەك پێشان ...
خەلك لە مە بترسن .. ؟
یان تێگەیشتونە و خوشیان دەوێین .. ؟
**هەسن** : جیاوازی نی‌یە .. بترسن یا خوشیان بوێین .. !
گرینك ئەوەیە تێرمان‌کەن .
**مەمو** : چون جیاوازی نی‌یە ..
پێشان دەیانگوت : چاوش و موترین
نازانن ئێمە کەلەتور بویان دروست دەکەین
مێژویان تومار دەکەین
تا دوا روژ قازانجی لێ‌بکەن
**هەسن** : برام ئەوە پیشەمانە ..
وا بو خومان دەلێن .. کارمان پێ چی‌یە .. ؟
**مەمو** : «قسەی دەبرێ» نا ... نا ... برام وا نی‌یە
ئەوەی ئێمە دەکەین هونەرە
زور کەس ئیمرو پێوەی خەریکە
**هەسن** : برام ... زگمان هاوار دەکا
زگ چی لە هونەر بکا .. ؟
**مەمو** : هونەرمەندان هەمیشە لە ئازاردا ژیاون
تا بە ناخوشی فەوتاون
**هەسن** : گەر زگ تێر بوو... مردن با هەر هەبێ
**مەمو** : ئەو خەلکەی نرخمان نازانن
لە پاش مردن ...
پەیکەر بومان دروست دەکەن
ئەوەیە منی ئازار دەدا .
**هەسن** : «قسەی دەبرێ» برام گەر لە برسا مردم
با هەر قاورمە بدەن لە پەیکەرم
سودی چی‌یە .. ؟

**مەمو** : خۆ وایە ..
ئێمە تا ئێستا میللەتەکەمان نامانناسێت
هەر باسیشمان ناکەن
گەر چی لە سەر ئەزمانی هەموویانە
شیعرو بەیتەکانی ئێمە .. !
**هەسن** : دە لێیان بپرسە ... کا دەمانناسن ... ؟
«ئیشارەت بۆ دانیشتوان دەکا ...»
**مەمو** : دەزانم ... بەلام .. «ئیشارەت بۆ دانیشتوان دەکاو لە گەڵیاندا قسەدەکا» :
ئەرێ خەڵکینە ...
ئەنگو گێنج خەلیلو حەفسەد دەناسن
چەتوو شیرین ... کولکو دەزگیرانەکەی
ئەو شەرانەی کورد کردوویەتی
بە شیعری ئێمە لە ناوتان ماون ..
چون نامانناسن ... ؟
«هەراو قەلەبالغێك لە دەرەوەی شانۆ دێت .. (هەسنو مەمو) خۆیان لە لایەکی شانۆدا دەشارنەوە ... شاعیر لە گەڵ چەند کەستیتر بە جلو بەرگی کوردی دێنە ناو ژوری شانودا ..»
**شاعیر** : برایەکان ... ئازیزەکان ...
من لە هەستی رۆژ دەگەرێم
لە تریفەی مانگ دەگەرێم
لە ڤیان باران بو زەوی دەگەرێم
پەروانە بو پەیوەندی لە گەل گوڵدا هەیە
بلبل بۆ دەخوێنێ
دڵی دلدار کە یارەکەی دەبینێ
بۆ لێدەداو دونیا هەلدەپەرێنێ
**ژمارە (1)** : ئەوە تو چی دەڵێی‌و ... چیت لە بەردایە
دەڵێی شێتی و کەتێیە ئەم لایە
**شاعیر** : من شاعیرم و لە هەستی مروڤە پرسیارم
دوزینەوە بیری پاکە ئیش‌و کارم
**ژمارە (2)** : پێم نالێی بۆ وەك قەرەقوزی
دەڵێی فەردەی تەپ‌و توزی ... !
**شاعیر** : نامناسن بۆیە نرخم نازانن
گوێم لێبگرن‌و مەبەستم بزانن
**ژمارە (3)** : دەڵێی گەرێن بە رێگای خۆدا بابڕوا

ئەوە شێتەو هیچ پێی ناکرێ بڕوا
**شاعیر** : براکانم ... لێم تێبکەن ...
من شێت نیم ... بوارەم بدەن
گەرانی من بو ئەکسیری ژیانە
مەبەستم دوزینەوەی ڤیانە
**ژمارە (1)** : کورە ڤیانی چی‌و ترەماشی چی
تۆ سەرخوشی ... بۆ لا ناچی
**ژمارە (3)** : راوەستن برا کانم
شتێکی لایە وابزانم
**شاعیر** : بەڵێ .. بەڵێ ... شتم زۆرن
گەر تێم نەگەن ... لێم ببوورن .
**ژمارە (2)** : بابە برو لە کوڵان بەوە
ئیشمان زۆرە لێمان بەوە
**شاعیر** : ئازیزەکان .. گەر لێم بپێچنەوە
بزانن لە چی دەگەرێم
هیچ کاتێك لە کولم نابنەوە
**ژمارە (3)** : باشە ....
لەو گەرانەدا چێ مەبەستت هەیە ... ؟
ناوی ڤیان دێنی‌و نازانین ئەوت بۆ چی‌یە ... ؟
**شاعیر** : ئەز لە عاشیق‌و یاران ئەپرسم
ئەز لە بەزربوونی ڤیان ئەترسم
ئەو ڤیانەی لە دلدا ... جێگیر دەبێ
لە هەموو جیهانم پرسیوە بەڵکو
وەلامم لە لاتان دەسگیر دەبێ
**ژمارە (3)** : هاورێی شاعیر گەر بزانی
خاوەنی وشەی ڤیان ئێمەین
ڤیان لە لامان رواوە
بەهێز بوەو بەخێو کراوە
خواردن‌و نوشینمان ژیانە
هەناسەو هەستمان ڤیانە
**شاعیر** : مروڤەکم دەوێ ئاخوتنی ڤیان بێ
لە ژیاندا خەریکی نەمری ئەڤین بێ
**ژمارە (2)** : ئەوە ئیشی ئێمە نی‌یە
بو ئیشی وا زۆر کەس هەیە
**ژمارە (1)** : برو لە پالەوانانی عیشق‌و ژین بپرسە

لە گێنج خەلیلو حەفسەد ، لە مەمو زین بپرسە
**شاعیر** : ئەوانە لە کوێن ... ؟ ئەرێ ماون .. ؟
لە کوێی لێیان پرسم .. ؟ ئەوانە گلینەی چاون
**ژمارە (3)** : دوو برا هەن لە کۆنەوە ژیاون
لێیان پرسە .. ئەوان لە عیشقدا سوتاون
**شاعیر** : دە پێم بڵێ کاکە ئەوانە کێن
ناویان چییەو نیشتەجێی کوێن ... ؟
**ژمارە (3)** : یەکەکیان هەسنەو ئەوی دی مەمویە
جێگایان ئەم خاکەی پڕ کلویە
هەر ژوانی بوی بچی دەیان بینی
لە وێ دەتوانی بیاندوێنی
«شاعیر دەسورێتەوە لە ناو شانـودا .. ژمارە (1) و (2) و (3) دەردەچن»
**شاعیر** : کا ئەوانە لە کوێن ..
لە هەوا دان یا لە زەوین
گەر خاوەنی ڤیان بن ...
لە گورانی منالان .. یا لە ئاوازی مەلان
تێر نابن و هەر دەگەرین
«هەسنو مەمـو لە جێگای شـاردنەوەی خـویانـەوە خەریکی تەماشاکردنی ئەکتەرەکانی ناو شانودان و لەکاتەی ناویان دیت هەسن دەلێت :
**هەسن** : برا گیان تە گوهـ لێیە .. !
لە مە دەگەرێ ناومان دێنی
کە چی نازانین ئەوە کێیە .. !
**مەمە** : وەرە بروین ببینین
مەبەستی چییە بیدوێنین
«شانو تاریك دەبێو هەموو روناهی دەکوژێنەوە»

«تابلوی سێیەم»

شاعیر دێتە ژورێو گوچانەکەی بە دەستەوەیە لە ئەرز دەداو جار جاریش رایدەوەشێنێ یان دەسورێنێ ... لە لای تری شانو هەسنو مەمو دێنە ژورێو ئیشارەتی بو دەکەن .»
**مەمو** : ئەمەیە ... ! ؟
**هەسن** : بەڵێ خوی بو . !

**شاعیر** : برایان ئەنگو کێنە .. ؟
**مەمو** : بوکاکە .. ؟ تو لە چێ دەگەرێی .. ؟
**شاعیر** : برام دوو کەس هەن .. دەبیا بیانبینم .. !
**هـەسن** : شەپـرزە مەبـە ... ! ناویـان چییە .. ؟ ئـەوانـە کێن ... ؟
**شاعیر** : یەکەکیان مەموو ئەوی دی هەسن .
**مەمو** : «بە پێکەنینەوە» : ئەوە هەسنو من مەمومە
**شاعیر** : تو خوا ... ئەوە ئەنگون
هیندە گەراوم بە دواتان ... تا پایەکانم ماندووبون .
**هەسن** : چیت دەوێ ... ؟ چیت مەبەستە .. ؟
**شاعیر** : پرسیارم لە ئەنگو .. شتێکی ئاسانە ، لە بەینتانا ڤیان چونە .. ؟ پڕ خوشییە ... یا پڕ ژانە .
**مەمو** : ڤیانی گشتیت دەوێ ... یا تایبەتی .. ؟ !
**شاعیر** : کەی ڤیان تایبەتی بویە .. یا گشتی .. ؟ !
**هەسن** : ئەدی قوربان ... چیت گەرەکە لەمە
زکمان لە برسا وا لەمە لەمە
**شاعیر** : دیارە شاعیری ئێوەە برسییە
بێ نانو ئاو ... هەمیشە لە رێیە
دیارە بە بێ رێزو نرخ لە جیهاندا دەژین
میللەت نازانی ئەنگو مێژو دەنوسن
**مەمو** : ئێمە واینو ژیانمان وایە
هەمو تەقەلامان بە نرخی کایە
**شاعیر** : کول نەدەن ... مێژو بنوسن
لەو جیهانەدا ڤیان تومارکەن
**هەسن** : چێ مەمی ئالا لە گەل زیندا
یا بنەوش لە گەل جەبەلیدا
ڤیانی لاس لە گەل خەزالدا
شیرینو هاورێیەتی فەرهاددا
هەزار هەزاری وەك وان .. نەمرمانکردن .
بە جەنگو لێكدان .. بە ئاواز گوتن
بە خوێنی دلان ... بە برسیو تێهنی
نەمرمان کردن
**شاعیر** : کاکی برا ... داخوازم ئەوە
ئەو ئەڤیندارانە بە چاوان بینیم ..
**مەمو** : بو چیتە .. ؟

**هەسن** : لێیان گەرێ .. با دەردمان زیندو نەبێتەوە
**شاعیر** : هەمو جیهانم دیو پشکنیم
هیچ ئەڤینداڕەك نەما لێی نەپرسم
با بزانم ڤیان لە لای ئێوە چونە
بۆ چی یە ... و نرخ و بەهای چەندەو چونە
**هەسن و مەمو** : وەرە .. با بڕوین .
**شاعیر** : با بڕوین .
«روناکی کز دەبێ .. هەموویـان لە شانـو دەردەچن و تاریـك دەبێ ...»

## - تابلوی چوارەم -

شـانو ڕەوشـەن دەبێ ... هیچ کـەس تێدا نی یـە .. دەنگی کاویسە ئاغا لە پشت شانو لە موسەجیلەوە دێت کە گورانی گێنج خەلیل دەلێت . پاشان کورە گەنجێك دێتە ناو شانو شەپرزەو نارەحەت دیارە تەماشای ئەو لاو ئەو لا دەکا لە لای تری شانو شـاعیرو هـەسن و مەمـو دێنە ژورێ .. خـویان لە لایـەکـدا کودەکەنەوە و دەشارنەوە بۆ ئەوەی کورە گەنجەکە ئاگای لێیان نەبێ :ـ
**کورەکە** : تو خوا یاران وەرن بمگەنێ
وا دلم بویتە گەمی ل ڤێ دنێ
لە دەریای عیشقدا بێ ئەنگەر ماوە
شەپولی ئاو و زریانی توند
یارتی پێ دەکەن و ئارامی لێ براوە
**شاعیر** : ئەوە کێ یە .. ؟
**مەمو** : ئەوە گێنج خەلیلەو لە یارەکەی دەگەرێ .
**شاعیر** : «دێتە پێشەوەو نێزیکی گەنجەکەی دەبێ»
وەرە هەڤال چی تە .. چیت گەرەکە ... ؟
**کورەکە** : دەلێم گەرێ ... !
**شاعیر** : چون ئەبێ کاکە .. چی تە .. ؟
**کورەکە** : من دیلی بسکی شوخێکم ..
گەر بێتە دەر .. مانگی چواردە شەرمزاردەکا
**شاعیر** : ئەرێ کاکە .. ڤیان چی یە ... ؟
**کورەکە** : ڤیان .. ؟ ! ئاخ ... ڤیان .. !!
ڤیان تیرێکە لە جەرگی مروڤ دەدا
چون هەوا پوش هەلدەگرێ
وەها ئارامی لە گیان دەبرێ
**شاعیر** : وەرە کاکە شتێکت پێ بلێم .. دلت ئارام بێ
گیانت دوورکەم لە هەلپەرین .
**کورەکە** : دەلێم گەرێ ئێشم بە تو نی یە
دلم بە بومبای عیشق پەر پەر بوە
بە ئاخوتن هیچم بە دەست نایێ
زۆر شتم دیوەو زۆریش گوێم لێ بوە
«کورەکە بە پەلە پەل و ناراحەتی دەسورێتـەوەو دەردەچێ لە شانو ...»
**مەمو** : کاکی شاعیر دیتت ئەو شورە لاوە
بە ئاگری عیشق دلی برژاوە
**شاعیر** : دیتم .. بەلام ...
«لەو کاتەدا کچەك دێتە ژورێ و بە ناز دەسورێتەوەو شـاعیر قسەی دەبڕێ و لە گەل هەسن و مەمو تەماشای دەکەن و شاعیر دەلێت»
**شاعیر** : ئەم شوخە کێ یە .. ؟
**هەسن** : ئەم شوخە حەفسەدی ناوە
لە تیری چاوی ئەو .. دلی گێنج خەلیل براوە
**شاعیر** : حەفسەد شوخێ .. گێنج خەلیل کا ... ؟
ئەو ڤیانەی بەرد بە ئاو دەکا
بە گورانی پر سوز گازت دەکا
فرمێسکەکانی چاوی تۆ دەگرینێ
ئاموزات بو ... لە بیرت چو ... ؟!
بە تەم پر بو .. ژیان و مێژو !
**حەفسەد** : ڤیان .. !!
هەڤال زۆر مەزن بوو
لە سنوری ئاموزاکەم .. وا تێ پەربوو
لە بازنەی تەنگی یەك دلدا ... نەما دەرچو ..
**شاعیر** : شوخی جوان ... !!
کام ئەو بازنەی دەتکردنە ئال
ئەو خزێمەی دەبونە بسمار
گری و فیغان بو کوێ ی دەرچو
بۆ یارەکەت .. لە بیرت چو
**حەفسەد** : کاکی برا ...
ڤیانەکەم .. بو هەوایە

دەروا .. دەروا ... بە سەر لوتکان‌دا دەگەڕێت
ماچی کانی‌و ڕوبار دەکا
دەست لە ملی شوانان دەکا
لە گەل هەناسەی منالان .. تێکهەل دەبێ
لە گەل نێرگزو کەو ... شایی دەکا
«خوی دەسوڕێنێ‌و بە تیزو کەمی‌یەوە تەماشای شاعیرو هەسن‌و مەمو دەکا و دەردەچێ لە شانو ... کە شاعیر دەیەوێ قسەی لەگەل بکا و بە دوای‌دا دەروا بەلام مەمو شانی‌دەگرێت و دەلێت» :

**مەمو** : کاکی شاعیر لێ‌ی گەرێ ...
وا دەبینی لە پەرژینی خوپەرستی ... چوتە دەرێ
نایەوێ بوت‌پەرستی ... لە سنوری ئێمە دەرچوە

**شاعیر** : چوَن ... چوَن دەبێ ئەڤیندار
دوستی خوی بە جێ بێلێ‌و
دلی بمینێ هەدار

«لەو کاتەدا کچێکی‌تر ...تە ژورێ ... شەپرزەو نارحەت‌و تەماشای دەورو بەری دەکاو دەلێت ...»

**کچەکە** : من شیرینم یاری چەتوم کا
نەبەزو مێری مەیدانم کا

**شاعیر** : تو شیرینی ؟ .. ژیانی لاوان تال دەکەی ... ؟
گەنجی پر هێز .. بێ تواناو لاواز دەکەی ... ؟

**شیرین** : بەلێ ئەزم شیرین ... ئەزم شوخ
ئامادەم بژیم لە گەل یارم
بە هەژاری لە ناو کوخ
لە گەل یارمدابم هیچ پەکم بێ نی‌یە
برسی بم لەم ژیانەدا ... یا نەمینێ کلوخ .

**شاعیر** : تو ناوەکی بو زور گیانان
تو جانەکی بو زور لەشان
یارەکەت ... چێ فەرهادە یا چەتویە
یا کولکە یا سلویە
زور دل بو تو بە پەروشن
زور گەنج لە ڕێگای تو ...
بێ مێشك‌و هوشن

**شیرین** : بەد بەختیمە ... بەد بەختیمە
لێم گەرێ با بروم‌و بلێم
هەزار جار بەد بەختیمە

«بەشەپرزەیی‌و ناراحەتی لە شانو دەردەچێ لە لای‌تردا گەنجێکی توندو بە تواناو بە جلی کوردی دێتە ژورێ و تەماشای خەلکەکە دەکا ...»

**کورەکە** : چەتوی خاوەن ئەسپ‌و سەنگەر ئەزم
دوژمن شکێن‌و نەبەزم
لە ڕێگای شوخێکدا جەنگم دەکرد
بەلام لە ئاسوی بوت‌پەرستی تێ‌پەریم

**شاعیر** : گەنجی بە دل .. دیارە خوشەویستیت نەماوە
گولی عیشق لە دلت‌دا چرمسیوە

**چەتو** : کاکی برا وا تێ‌نەگەی ...
ئێستا .. دلم بوتە کانی ڤیان
لە پێشودا عاشیقی گولێك بوم
کە چی ئێستا دلم بوتە ...
ئەڤینداری گولان .. هەموو گولان
ڤیانم لە گەل ڕوژا دابەش دەبێ
لە دلی هەمو مروڤێك لەم زەویەدا
دارو درەخت .. تەیرو ئاژەل
جێ گیر دەبێ .. !!

**شاعیر** : چوَن ئەبێ ... چوَن ... ؟

**چەتو** : هەر گولەك کە خونچە بگرێ
شیرینە بوم
هەر منالەك ئەزمان بگرێ
شیرینە بوم
هەر کانی‌یەك کە ئاو هەلدا
شیرینە بوم
هەمو زەوی لە بەرهەمدا
شیرینە بوم
من ڤیانم بردە سەرێ
لە سنوری عیشقی یەکەکدا ... دەرپەرێ
لە توخیبی بوت‌پەرستی ... چوتە دەرێ
من عاشیقی خاکم
ئەڤینداری ولاتی خو ... مردوی ڤیانی پاکم

«بەتە واوکردنی ئاخوتنەکەی لە شانو دەردەچێ ...»

**مەمو** : کاکی شاعیر .. ئێمەدەروین ... تو لێرەبمێنە

**هەسن** : ئێمە بە پەلەین و زۆر برسین
دەچین .. تا نانەك پەیدا بکەین
**شاعیر** : برایان .. وا من ئەو خەلکەم ناسی
بۆی ناوێ زیاتر بوم بکەن باسی
**مەمو** : خوا حافیز
**هەسن** : حوا حافیز
**شاعیر** : خواتان لە گەل .
«هەر دوو کیان دەردەچن و شاعیر دێت و دەچێت و سەری دەسورینێ و روناکی کەم کەم کز دەبێ و پاشان تاریك دەبێ .»

## - تابلوی پێنجەم -

شانو روناك دەبێ و لە لایەکەوە شاعیر دێتەوە ژورێ کە ماندوو کەسیرەیە و دەلێت :-
**شاعیر** : ئای چەندە ماندووم ... بەلام
گەر لە روناهی بپرسم ... پێم‌دەلێت ... ؟
ڤیان چی‌یە .. ؟
گەر لە هەوا بپرسم ... پێم دەلێت ... خوشەویستی چی‌یە ... !
بەلام مرۆڤ ... مرۆڤەکان
لە دلی هەر یەك‌یاندا ... ڤیان شتێکە
لەو وەلامە جوراو جورانە
تێنەگەیشتم .. ڤیان چی‌یە .. !
«کورەکی شەپرزەو ناراحەت بە جلو بەرگی شرو شەپلی وەك شێتان دیارە دێتە ناو شانو ...
**کورەکە** : هۆی ئێش و ئازارم ... شوخێکە
دوژمنی ئارامی گیانم ... جوانێکە
قاتلی من لەم جیهانەدا لێوی ئالە
من «لاسم» ئەوەی لێم بەزربوی خەزالە
**شاعیر** : چی‌یە .. ؟ چیت لێ وون‌بوە ... ؟
**کورەکە** : ئەزم لاس و لێم تێچکوە ژیان
لە گەل خوێنمدا تێکەلە ڤیان
لە دەریای عیشقدا ئابلوقەدراوم
ئومێدم نی‌یە و هیوا براوم
**شاعیر** : گەر ڤیانت بۆ خەزالێکە ..
ئەدی خەزالانی‌تر
گەر ئەسیری بسکی شوخێکی
ئەدی لێو ئالانی‌تر
ژیان فرەوانەو پڕ لە روناکی
تەمەن درێژەو جێگای چالاکی
گەر ژیانت بۆ یەکێك بێ
ئەدی چون بیردەکەی .. لە پاشە روژی‌تر
**کورەکە** : دە لێم‌گەرێ ژانی دلم زیاتر نەکە
پێشان دلم گەردون‌بو .. جێگای هەموو کەس
بەلام ئیستا بوتە پاوانی یەك خەزال و بەس
«بە ناراحەتی دەسورێتەوەو شاعیر بە جێ دێلێ و دەردەچێ و شاعیر دێتە پێشەوەی شانو .»
**شاعیر** : پێم سەیرە ئەو رەوشتە
کور ئەسیری شوخێکەو
کچ دیلی خوشەویستی ژیان
کچ عاشیقی کوریکەو
کور دیلی ڤیانی نیشتیمان ..
«لەو کاتەدا کچێك دێتە ژورێ شانودا لە سەرەخو دەروات و تەماشای ئەو لاو ئەو لا دەکات و دەلێت :
**کچەکە** : من کچە کوردێکی نەشمیل و جوانم
عاشیقی چیاو روباری کوردستانم
عیشقی من لە بازنەی گولێك تێ‌پەری
بو گولی ئەو خاکە پێشکێشە گیانم
**شاعیر** : کچی نەشمیل ... شوخی کوردستان
بۆ یارت هێلاو چویە گورستان
**کچەکە** : تو کێ‌ی .. ! ؟
**شاعیر** : ئەز شاعیرم دەگەرێم لە هەستی ڤیان
ئەز شێتی گەروکم بو ئەکسیری ژیان
**کچەکە** : کاکی برا چاك بزانە
من لە رەنگی گولی گەنمی ... پێش درونە
داوی قژم داهاتوە
لە رەنگی ئاسمان و دەریا ... بە روژێکی سامال و جوان
تیشکی چاوم بو هاتوە
لە هاژەی روبارەکان ... لە دەنگی کەو بلبلان
ئاوازی ژیانم هاتوە

لە گوڵی بنارو چیایەکان .. لە باغی خوشی وڵاتم .
کراسەکەم رەنگ رەنگ کراوە
**هەڤاڵ** ... چون ڤیانم بو بوتەك بیٚ ... ؟
چوٚن ... چوٚن خوشەویستم بو ئەم سروشتە نەبیٚ .. ؟
**شاعیر** : سروشت تەنها ..؟
**کچەکە** : سروشت نە تەنها سروشتە
بەڵکو .. گیانە .. هەمو تشتە .. !
مروٚڤ .. زەوی ... چیا بنار
نێرگزو گوڵو هەمو شتی ئەم بەهەشتە
**شاعیر** : ڤیانت وەهایە .. ؟
**کچەکە** : ئەوەهایەو لە وەش زیاتر ..
«خوی دەسوریٚنیٚ و بە لەنج و لارەوە لە شانو دەردەچیٚ ...»
**شاعیر** : ئەمە لەم وڵاتەدا چی رویداوە
هەستی مروٚڤ لێك دابراوە
«دەنگی گریانی کچێك دێت لە دەرەوەی شانو .. شاعیر تەماشای دەوروبەری خوی دەکا .. کچێك بە شەپرزەیی دێتە ژوریٚ .. قژ ئالوزو جلو بەرگی نارێكو دەڵێت :ـ»
**کچەکە** : کچی میرو خوشکی میرو خاتون ئەزم
عاشیقی کوری هەژارو زوٚر زەبون ئەزم
ئەوی خانیلە ژیاندا هێنایە پێش ئەزم
عاشیقی مەم هەر یەك زینە ئەویش ئەزم
**شاعیر** : زینی کچی میری بوتان ئەتویی
هوٚی مردنی مەمی ئالان ئەتویی
**زین** : بەڵیٚ ئەزم ... مەم بوٚ من کەوتوتە زیندان
بەڵیٚ ئەزم .. عەشقی من بوٚتە داستان
**شاعیر** : بابو برات بوٚ دوژمنی ڤیانن ... ؟
ئەرواوە لە دڵیاندا .. خونچەی خوشەویستی
بوٚ خاموشکەری تروسکەی ژیانن .. ؟
**زین** : دەڵیٚم گەریٚ ... با تەشەنە نەبیٚ ئاسورم
با بروٚم ... چارەییٚ بو یارم بنوٚرم
«زین دەردەچیٚ لە شانوو شاعیر دەڵێت»
**شاعیر** : خوزگا ئەو کورە هەژارەم دیتبا
بە بینینی «مەم» چاوم رەوشەن ببا
«دەنگی کورەك دەيێت کە شیعری «نەوروزەی پیرەمێرد دەڵێتو تا دێتە ناو شانودا تەواوی دەکا ... کورێکی توندو توستە ...

جلو بەرگی رێكو پێکی لە بەرە ...»
**شاعیر** : هەڤاڵ تو کیٚ ی ... ؟ بو کویٚ دەچی .. ؟
**کورەکە** : من لە زیندانا تەمەنم بردە سەر
ژینم تەواو کرد بە دەردو کەسەر
ئەز عاشیقی شوخێکی چاك بووم
لە هەموو ئاستەنگی ژیان بیٚباك بوم
بەلام ئیٚستا عاشیقی ژیانم
ئەڤینداری هەمو هەستی ڤیانم
**شاعیر** : چون عیشقێکە
**مەم** : ڤیان ئەوە سنور ببەزێنیٚ
عیشق ئەوە لە ئاسودەدا نەمێنیٚ
خوشەویستی من ... وەك روٚژە بو زەوی
کە تیشکی خوی‌دا ... هەموو شتێك سەوز دەبیٚ
**شاعیر** : واتە ڤیانت بەس بو زین نی‌یە .. !
**مەم** : زینە یارم ... بەلام ..
یارەکەی من لە کچێك مەزن‌ترە
زینی من ... چیاو مێرگو روبارە
زینی من ... هەستو سوزی دیارە
زینی من ... وڵاتمەو ... خوشم دەویٚ
**شاعیر** : دەوا بڵیٚ ... !
**مەم** : دیارە تیٚناگەی هەڤاڵ
دەروٚم لە پێناوی زینم ... گیانم بەختکەم
نەکە لە دەستم بچیٚ ... وەکو زینی‌تر ... هەڤاڵ .
«مەم دەردەچیٚو شاعیر لە سەر سورماندا دەمێنیٚ ...»
**شاعیر** : جێگای شەپرزەیی و گومانە
چیٚ جورێکە دیتنی ئەو ڤیانە

**«شانو تاریك دەبێت»**

**ـ «تابلوی شەشەم» ـ**

«دەنگی دوولو زورنا دێت لە دەرەوەی شانو ... شانو رەوشەن دەبیٚ و چەند کچو چەند کورێك دێنە ژوریٚو شایی دەکەن ... چیروك بێژ لە ناو هولی دانیشتن‌دا هەلدەستێتو هەوار دەکا ...»

چیروك بێژ : راوەستن با بزانم
ئەم هەرایە چی‌یەو بۆ چی‌یە .. ؟
هەمو شتێك بە کەیفتان نی‌یە .. !
پێم بلێن .. با تێگەهم ... ئەمە چی‌یە ... ؟
یەکەك لە گەنجەکان : دە وەرە ببینە .. !
چیروك‌بێژ : چی ببینم .. ؟ !
گەنجەکی‌تر : شایی‌مان .. بۆ خوشی‌یە
شایی‌یە دڵ خوش دەکا
شایی‌یە گیان شاد دەکا
شایی‌یە لەش بە هێز دەکا
«لەو کاتەدا چیروك بێژ دەگاتە سەر شانو و دەڵێت :ـ»
چیروك‌بێژ : دە با شە باش ... با شایی بکەین .
«هەموویان خەریکی شایی رەشبەلەك دەبن ... لەو کاتەدا شاعیر دێتە ناو ژوری شانوداو لە دەوری شایی‌یەکە دەسورێتەوە و شایی‌کەش هێدی هێدی دەردەچن لە شانو لە گەل شاعیرەکە و چیروك بێژ تەنها دەمێنێتەوە»
چیروك‌بێژ : ئازیزان .. گوێگرو بینەران .. نازانم بە دڵتان بو یا نە .. ؟ ئەو هەموو کارەساتەی لە سەر ئەم شانویەدا هاتی‌یە پێش چاوتان .. ئەم کارەساتە چیروك نەبو .. چونکە لە ئاستی چیروك‌و بەیت و مەلحەمەکانی ئێمەی کوندا نی‌یە .. چیروك‌و مەلحەمەکانی کون وا پێشاندەدا کە مەم بو زین دەمریو لاس بو خەزال کارەسات دەبینی‌و فەرهاد بو شیرین چیا دەتراشی ... گێنج خەلیل بو حەفسەد جەنگو شەر دەکا .. زین یاخی دەبی لە باب‌و براو سەروەت شیرین تەختی سەلتەنەت دەهەژینی بو فەرهاد خەزال بی‌هێز دەبی‌و دەمری بو لاس .. حەفسەد کەمەری خوی دەکاتە ناڵو خرێمی خوی دەکاتە بزمار بو ئەسپی گێنج خەلیل ... وەهامان زانیوەو گویمان لێبوە لە لاوك بێژو شاعیر و چیروك بێژان ... بەلام ئەو کارەساتەی ئەو شەوەمان دیت وا نەبو ... ئەو شاعیرە کون‌و گەروکە وەك ئێمە سەری سورماوە ...
بۆ ئەم ئەڤیندارانە لە یارەکانیان یاخی بوینە ... ؟
بۆ یارو ئەڤیندارەکان ... یارەکانیان بە جی دێلن‌و خەریکی یارو خوشەویستی‌تر بن ... دەبیا شتێکی گرینکتر دوزیبیانەوە .. وا بزانم ئەوە شتێکی دیارەو بی ناوی هێشتا لە سەری بروم کە چی هەر وەکو مێشکم دەڵێت‌و هەست دەکەم ئەم شاعیرە کون‌و گەروکە دیاریەکی پی‌یە ... ئەو خەلات چی‌یە .. ؟ ... بو کی‌یە .. ؟ بو بە دریژای مێژو ئەم خەلاتەی پی‌یە و دەگەری .. ؟ بە هیچ کەسیشی نەداوە .. کە چی ئەگەر کەسەکی هێژای ئەم دیاری‌یەی دوزی‌یەوە .. ئایا ئەو کەسە دیاریەکەی وەردەگری و پی رازی دەبی یا نە .. ؟ ! ئەم هەمو شتانە لە پەردەی دوایی شانوگەریەکەماندا دیار دەبی ... !
«روناکی کز دەبی و چیروك بێژ دەردەچی لە شانو ..»

## ـ تابلوی هەفتەم ـ

دەنگی بەستەی «شێخانی» بە دەنگی «مەحەمەد عارف» لە پشتی شانووەوە دێت‌و شانو روناك دەبێت و شاعیر دێتە ژوری و دێت‌و دەچێت‌و خەریکی بیرکردنەوە دەبێت .. دەست‌و چاو سەرو گیانی دەجولێنێتەوە ... هەر وەك قسەی لە گەل خوی دەکا تا گورانیەکە تەواو دەبێت‌و دەڵێت :»
شاعیر : چی جورە مروڤن ئەمانە
لە تاڵ ترین کاتا دیلان‌و شایی‌یانە
«ئەو پیرەمێردەی لە پەردەی یەکەمدا شاعیری دیت «خانی» دێتە ژوری‌و دەڵێت» :
خانی : ئەوانە لە تاریکترین روژی ژیانیان
دلیان فرەوانترە لە گەردونی بی پایان
بو خوشی‌و ئازادی بە ئاوات‌و ڤیانیان
پێشکێش بە مروڤ‌و زەوی‌یە هەستی خوشەویستی‌یان
شاعیر : ماوەییکی درێژە وا دەگەریم ...
خەلاتێکم پی‌یە
بۆ یەکەمین پالەوان
لە توپی ئەم زەوی‌یەدا
زورم دیت خاوەن ڤیان
بەلام هیچ کەسم نەدی
خاوەن ناوو نیشان
هێژای ئەم خەلاتە
جگە لە لاوی کوردستان !
«هەلهەلەیەك لە دەرەوەی شانو هەلدەستێت و دەنگی گورانی «ئازیز بەهارە» دێت‌و کچێك‌و کورێك دێنە ناو ژوری شانودا

دەستی یەکیان گرتوە .. هاتو چون دەکەن و پرەمێرد «خانی»
و شاعیر لە لای تری شانو وەستاون ...»

**کچەکە** : وا بەهارە سروشت بەرگی گۆڕیوە
فرمێسکی چاوی کانی لە ژێر گلا وەریوە
خۆر تیشکی میهرەبانی بە زەوی دابەشیوە
دلی بریندار بێ‌دەرمان تەشەنەو تەزیوە

**کورەکە** : گوێمان لێبو .. بە دیاری بومان هاتوە خەلات چونکە
خاوەن ڤیانین ..
بو ڤیان وا مان بە سەر هات
کارمان ڤیانەو پیشەمان ڤیان
خواردنمان ڤیانەو هەناسە ڤیان
دەوەرن بمان بینن
خوێن لە دلمان دێتە خوار
چی لە دیاری بکەین
دل پر برین و ئازار

**شاعیر** : خەلاتی من دیاریەکی پاک و چاکە
ئەم دی هێژای ئەو دیاری‌یە .. لەم خاکە
کە چی ئەنگو هەمیشە ژیانتان ڤیانە
ئەم خەلاتە بو ئێوە زۆر ئەرزانە

**کچەکە** : دلمان کولە کاکی برا .. دیاری بێ کەلکە
تەشەنە بوە برینمان ... دەرمانمان گەرەکە

**شاعیر** : شوخی جوان پێشتر دو جور کەم دی
عاشیقی سروشت و ... عاشیقی لاو چاک
یەکەك عاشیقی یار بو
ئەوی دی ئەڤینداری خاك

**کچەکە** : هەڤال ... حەفسەدت دی ... شیرینت دی
زینت دی و خەزالت دی
جیاوازی نەماوە ... هە مویان لێکدراون
من حەفسەدم ... ئەز شیرینم
ئەزم زین و ئەزم خەزال
ئەزم نیشتیمانی شەپال
ئەز عاشیقی چیاو چلۆم
ئەڤینداری دار بەروم
ئەو گەنجەم دەوێ وەك من کوشتە بێ
بوت پەرستی نەکات و
ڤیانی لە دلدا بۆ ئەو شتە بێ

**شاعیر** : ئەو جورە گەنجە لە کوێ‌ی دەبینی .. ؟

**کورەکە** : برای شاعیرم ... من سەودا سەرم
ئەزم ئەو گەنجە ... من ڤیان پەروەرم
من عاشیقی حەفسەدو زینم
خوشەویستی خەزال و شیرینم
ئەڤینداری بەفرو ئاژەلی چیایەکانم
ئەز چەتومە .. ئەمن لاسم
ئەز فەرهادم .. من گێنج خەلیلی کەساسم
دلم فرە پان و بەرینە
جێگای یارو مرۆڤ و زەمینە
ئەم دلە ... دژی خو ڤیان و بوت پەرستینە .. !

**شاعیر** : ئەگەر وابن ... روحەکانم
هیچ دەرمان نی‌یە بو برینە کانتان
نوژداری ئازار ..
ئەنگونە بە خوتان ... !

**کورەکە** : گوتمان ... دیاریەکەت نامانەوێ
برینمان تەرە دەرمانی دەوێ

**شاعیر** : راستی‌تان گوت ... ئەی گەنجی نەبەز
دلی بریندار دەرمانی گەرەکە
دیاری بێ‌سودە بو دلی پر گەز

**کچەکەو کورەکە** : دەرمان‌مان دەوێ ... دەرمان‌مان دەوێ
بو دلی بریندار دەرمان‌مان دەوێ

**کچەکە** : دیاری بۆ چی‌یە ... دلی پر برین
دەرمانی دەوێ برینی دێرین

**پێکەوە** : دەرمان‌مان دەوێ ... دەرمان‌مان دەوێ
بو دلی بریندار ... دەرمان‌مان دەوێ

**شاعیر** : هیچ دەرمان نی‌یە ... بو برینەکانتان
نوژداری دەردتان وا لە کن خوتان

**کورەکە** : هاواری ئێمە ... بێ مەبەست نی‌یە
دەزانین برین دەرمانی چی‌یە

**پێکەوە** : دەرمان مان دەوێ ... دەرمان‌مان دەوێ
بو دلی بریندار دەرمان‌مان دەوێ

شانو تاریك دەبێ و تەواو

# کاروانی رۆشنبیری لە کوردستاندا

## لە هەولێر

**- ئێوارە کۆڕی چیرۆکی کوردی -**

**زانکۆی سەلاح ئەدین**

لەژێر دروشمی «زانکۆکانی عیراق مەڵبەندی تیشکی بیری شۆرشگێرانەو کەلچەری موڵتەزیمن» کۆلێژی پەروەردە لە زانکۆی سەلاح ئەدین لە 24 — 1984/3/29 وەرزێکی رۆشنبیری بەپێزی پێشکەش کرد ، لەم وەرزەدا چیرۆکی کوردیو شیعری کوردیش تێیدا بەشداربوون .

سەعات سێی رۆژی 1984/3/25 ئێوارە کۆڕی چیرۆکی کوردی بوو کە بەرەو رووی چیرۆکنووس مامۆستا مستەفا سالح کەریم کرابووەوە .

چیرۆکنووس لەسەرەتادا وتی :

[کاتێك کە رووم لێنرا بۆ بەشداری کردنم لەم وەرزەدا باسێك لەسەر چیرۆکی کوردی ئامادە بکەم ، بەلام ئەبینم برای چیرۆکنووس مامۆستا حسێن عارف لەو باسەیدا کە لەیەکەم دیداری چیرۆکی عیراقیدا 20 — 1978/8/25 پێشکەشی کرد گەلێ لایەنی بە دوورو درێژی باسکردوە



هەروەها لەگۆڤاری «الاقلام»ی شوباتی 1984 دا دوو باسی گرنگی تێدایە دەربارەی ناوەرۆكو تەکنیك کە مامۆستایان : د .عز الدین مستەفا رەسولو حسێن عارف نووسیویانە .. ئەمە جگە لەوەی نووسەران مامۆستایان سەباح غالیبو د .نافع ئاکرەییو عەبدوللا عەزیز خالد دەربارەی ئافرەت لە چیرۆکی کوردیدا و نامۆیی لە چیرۆکی کوردیداو خۆماڵێتی لە چیرۆکی کوردیدا .. تا .. باسیان نووسیوە .

لەبەر ئەوە ئەبوایە من لەسەر چیرۆکەکانی یەکێك لە چیرۆکنووسەکانمان باسێك ئامادە بکەم ، ئەم لایە نەشم بەگران هاتە بەرچاو چونکە وام بەلاوە پەسندتر بوو کە گوێگر لەوەوپێش ئەو چیرۆکانەی خوێندبێتەوە بۆیە وا رێکەوتین کە تەنیا کۆڕی چیرۆك خوێندنەوەبێ ، بۆ ئەمەشیان ئەوەم بەلاوە باشتر بوو کە چەند چیرۆکنووسێکی کورد لە خوێندنەوەی چیرۆکەکانیان بەشدار بن بەلام تاوەرزێکی دی کە ئەم کارە دێتەدی و ئێستاش مەسەلەکە هاتە سەر ئەوەی چیرۆکی خۆم پێشکەش بکەم وە لەبەر ئەوەی ژمارەیەکی زۆر لە مامۆستایانو قوتابیانی زانکۆ ئەوانەی بە پەروٚشن بۆ شارەزا بوون لە چیرۆکی کوردیو بەلام زمانی کوردی نازانن ، وام بە باش زانی کە بەزمانی عەرەبی پێشکەش بکەم ..] .

دوا بە دوای ئەو پێشبینییە مامۆستا مستەفا سێ چیرۆکی خۆی بە عەرەبی خوێندەوە .

**یەکەمیان : قەلەم لەوەرگێرانی مامۆستا رەوف عوسمان .**

**دووەمیان : پردی وەنەوشە : وەرگێرانی مامۆستا عبدالکریم شێخانی .**

**سێیەمیان : مەلەکان بەرەو کوێستان ئەگەرێنەوە وەرگێرانی مامۆستا محەمەد بەدری .**

دوای ئەوەی چیرۆکنووس چیرۆکەکانی خوێندەوە دەمەتەقەیەکی گەرمو گوڕ لەسەر چیرۆکەکان بەرپا بوو ، وە

لەلایەن ئامادەبووانەوە گەلێ بیروڕاو سەرنجی ورد دەربڕا .

لەسەرەتادا مامۆستا د .نافع ئاکرەیی سەبارەت بە تەکنیك و خۆیی چەند سەرنجێکی لەسەر چیرۆکەکان دەربڕی .

دوای ئەو ئەدیبی بە ناوبانگ و چیرۆکنووس ، مامۆستا (د.شاکر خصباك) شادمانی خۆی دەربڕی کە لەم ئێوارە کۆڕەدا گوێی لە نموونەی چاکی چیرۆکی کوردی بووەو وتی [هەرچەند دڵنیام بەرای چیرۆکنووس چاوەڕێی ئەوەم لێ دەکات ڕەخنەی لێ بگرم بەلام بەدڵنیاییەوە دەڵێم ، ڕەخنە هەڵناگرێ ، چیرۆکەکان سەرکەوتووبوون چ لە ناوەرۆك و چ لەشێوەی نووسینیدا ، گەلێ مەسەلەی لەویژدانمان و ڕوژاند ، بەلام ئەبێ ئەوەش بڵێم کە چیرۆکنووس هەمیشە لەخوێندنەوەی چیرۆکدا ماف خوراوە ، چونکە چیرۆك لەخوێندنەوەدا بەسوودترە وەك لەگوێ گرتن ، واتە ئەولایەنە هونەرییانەی کە مەبەستە ئەشێ لەگوێگرتنێکی وەهادا لای زۆربەی گوێگران ڕوون نەبێ ، دووبارە پیرۆزبایی لە چیرۆکنووس کرد ..] .

دوایی ئەم بەڕێزانە نزیکەی (22) کەس لەبەشدارانی کۆڕەکە بە نووسین پرسیاریان ئاراستەی چیرۆکنووس کرد دەربارەی گەلێك لایەنی چیرۆکەکان باری سەرنجیان دەربڕی و چیرۆکنووس مامۆستا مستەفا وەلامی هەمووانی بەشێوەیەکی ڕێك و پێك دایەوە ، شایانی باسە کۆڕەکە نزیکەی دوو سەعاتی خایان و ژمارەیەکی زۆر لە مامۆستاو قوتابیانی زانکۆو و ژمارەیەك لە ئەدیب و ڕۆشنبیرانی شاری هەولێر تیایا بەشدار بوون .

## دامەزراندنی ئەمارەتی بابان
## و
## بنیاتنانی شاری سلیمانی

چالاکی یەکی تری وەرزی ڕۆشنبیریی زانکۆی صلاح الدین ئەوەبووکە لە 1984/3/27 موحازەرەیەکی بەنرخ لەلایەن مامۆستا [عبد ربە سکران إبراهیم] سەبارەت دامەزراندنی ئەمارەتی بابان و شاری سلیمانی پێشکەش کرا .

مامۆستای موحازیر بە شێوەیەکی زۆر وردو قوڵ و زانستانە لە سەرەتاو چونیەتی دامەزراندنی میرنشین و ئەمارەتی بابان دوا ووتی :

[... ئەمارەتی بابان لە دەورو بەری چەرخی حەڤدەهەمدا سەری هەڵداو پەلوپۆی دەستەلاتی خۆی بە هەر چوارلادا دەکوتاو سنووری گەیشتبووە : مەندەلی و بەدرەو ئالتون کۆپری و هەولێرو لەولاشەوە تاشاری سنەملی نابوو .

وەك سەرچاوە مێژوویی یەکان دەری دەخەن لە سەرەتای قۆناغی یەکەمدا چوار خێزان ـ تایەفە ـ حوکمی بابانیان گرتبووە دەست و پێنجەم تایەفەش سالانی 1500 — 1556 بوو . کە لە سەردەمی سولتانی عوسمانی سلیمانی قانوونی دابوو .

.. وەك وتمان سەرەتای حوکمرانی ئەمارەتی بابان لە (چەرخی حەڤدەهەم)ەوە دەستی پێ کرد کاتێ سولتانی عوسمانی محەمەدی چوارەم [1648 — 1687] ، ناوچەیەکی بەرفراوانی بە فەقێ ئەحمەد بەخشی کە ناوی لە ناوکورداندا بە (بابا)ی گەورە دەرکرد بوو .]

مامۆستای موحازیر زۆر هوشیارانە باسی پەیوەندی نێوان سەرەتای حوکمرانی بابان و حوکمی نادر شای کرد ، هەروەها دەوری کەریم خانی زەندی دەرخست کە چۆن دەستی بە سەر حوکمی ئێراندا گرت ، ئەوسا ڕووی لەو بوارەکرد کەبۆچی حوکمی ئەمارەتی بابان لە شوێنێکدا جێگیر نەبووەو نەچەسپیوە ، بەوەی :

- ئەمیرەکانی بابان ئارەزووی گواستنەوەی مەڵبەندی دەستەلاتیان کردوە .
- ئالۆزی بارو دۆخی ناوچەکە لەو ڕووە ڕۆڵی خۆی بینیوە .

### - پایتەختی ئەمارەتی بابان -

مامۆستای موحازیر لە شێوەی زنجیرەیەکی مێژوییداو بەپێی پلەو قوناغیەك لەدوای یەکی یەکان باسی شوێنی میرنیشینی بابانی کردو وتی :

[... لەسەرەتادا تا ئەمیری بابان لە دارشمانە دادەنیشت و ئەوسا ڕووی کردە مەرگەوە لە سالی 1669 شدا مەڵبەندی میرنشینی بابان گواسترایەوە بۆ ماوەت و دوابەدوای ئەویش چوونە قەلاچوالان و لەویدا لەنێوان سالانی [1670 — 1784] مایەوە ..] .

### - شاری سلیمانی یان پایتەختی ئەمارەتی بابان -



برای موحازیر سەبارەت بە بنیاتنانی شاری سلیمانیو ئەو بارو دۆخەی هانی ئـەمیرەکـانی بابـانیدا کە سلیمـانی بنیاتبنێن بۆ ئەوەی بکرێتە پایتەختی ئەمارەتەکەیانو وتی :

[ئیبراهیم پاشا کە لە بەغا لەسای حوکمی سلیمان پاشای گەورەدا ئەژیاو لەوێ چاو ورووی کرابووەوە بەهۆی زرنگیو لێهاتووی خۆی بیری زۆر قوڵو دوور دەڕوێشت . هەر بـۆیە بڕیاری ئەوەی دا کە پایتەختی میرنشینی بابان بۆ شـوێنکی لەبارو باشتر بگوێزێتەوە ، بۆیە بـڕیاری دا شـاری سلیمانی بنیات بنێو لە ساڵی 1784 بنیاتی تەواو بوو ، ئەگەرچی بەر لەو ساڵە واتە لە ساڵی 1782 مەحمود پاشا ناوێـك یەکـەم تەلاری لەگوندی مەڵکەندی دروست کرد ، کـە ئەمـە بوو بـە بەردی بنچینەی شاری سلیمانی .]

**- بۆچی ئەو شوێنە بۆ پایتەخت هەڵبژێرا ؟ -**

برای موحازیر لەبەر ڕۆشنایی بیروڕای نیو سـەرچاوە مێژوویەکانو ئەو گەڕۆکانـەی ڕوویان لەنـاوچەکـە کردوە ، سەرنجو بۆچوونی تـایبەتی خـۆشی لەمەڕ هـەڵبژاردنی ئـەم شوێنەی ئێستای سلیمانی بۆ پایتەخت دەر بڕیوەو وتی :

[1 - هـەر لە دێرەوە شـوێنی ئێستای شـاری سلیمانی بـە مەڵبەندێکی گرنگو پیرۆز ناسرابوو .

2 - لەچاو شوێنی قەڵاچوالاندا ئێرە بەربڵاو فراوانترەو بـە بەرییەوە هەیە مەودای سنووری ئەمارەتەکە فـراوانتر بکرێت .

3 - شـوێنی ئێستای شـاری سلیمانی چـواردەوری بەچیا تەنراوە ، ئەمەش خۆی لە خۆیدا بەرهەڵستێکی سەختو بەهێزە بەڕووی شالاوو هێرشی فارسەکاندا .

4 - ئەم ناوچەیە ئاوەدانەو چەندین کانیو کاریزو سەرچاوەی ئاوی ڕوونو سازگاری لێیە .

5 - سـەرەڕی یەکگـرتنەوەی کـاروانی بازرگـانیو هـاتـوو چووکردنی خەڵکی ناوچەکەیە .

6 - ئاو وهەوایەکی سازگارو خۆشی هەیە ، واتـە لە زستانو هاویندا مرۆڤ قارسو سەغلەت نابێو دیمەنی ڕەنگینو دڵرفێنی لە ئامێز گرتووە ..] .

**- چۆن ناوی سلیمانی نراوە ؟ .. -**

مامۆستا [عبد ربە سکران] سەبارەت بە ناونانی شاری سلیمانی ، بیروڕاو بۆچوونی گەلێ گەڕۆكو سەرچاوەی مێژوی بۆ پاڵپشتی قسەکانی هێنایەوە لەوانە :

[1 - ناونانی دوا پایتەختی ئەمارەتی بابان بەو هۆیەوە بووە کە کاتی خۆی ئیبراهیم پاشـا ماوەیـەك لەتەك والی بـەغا سلیمان پاشادا ژیاوە ، لەبەر ئەوە بەیادی سلیمان پاشا والی بەغداوە ناونراوە .

2 - لەبەر ئەوەی باپیرە هەرە گەورەی بابانەکان کە بە «بابا» گەورە بە ناوبانگ بووە ناوی سلیمان بووە .

3 - ئیبراهم پاشا کوڕێکی بووە ناوی سلیمان .

4 - گوایە والی مۆسڵیش هەر ناوی سلیمان بووە .

5 - گەلێ سەرچاوە ناونانی سلیمانی دەگێـڕنەوە بـۆ ئەوەی بەناوی کـوڕی فەتـح عەلی شـا ، شای ئێـران ، ناوی سلیمان بووە ..] .

**- لەبار چوونی ئەمارەتی بابان -**

سـەرچاوە نـزیكو دوورە مێـژوویەکـان ، لەبـارەی فەوتاندنی ئەمارەتی بابانو جوانە مەرگ بوونی گەلێ هۆی بۆ دەدۆزنەوە .. لەم ڕووەشەوە مامۆستای موحـازیر گـرنگترین هۆی لەبارچوونی ئەمارەتی بابان دەخاتە ڕوو کە لەمانەدا خۆی دەنوێنێ :

[1 - بەربەرەکانی ئەمیرەکانی بابان لە ناو خۆیاندا هۆیەکی بـەهێزو کـاریگەر بـوو ، بـۆ لاوازی ئـەمـارەتـەکـە ، بەجۆرێکی ئەوتۆ خەریکی بەگژا چوونی یەکتربوون کە دوژمنی سەرەکیان فەرامۆش کردبوو .

2 - تیرەی جاف پشتی کردە ئەمارەتی بابانو یارمەتی خۆی کێشایە دواوە .

3 - فارسەکان هەروەك پێشەی جاری جارانیان پشتیان کردە ئـەمـارەتی بـابـانو بـەپێی ئـەو پـەیمـانـەی لەنێـوان

ئیمپراتۆریەتی عوسمانی‌و ئێراندا لەساڵی 1847 بەسترا ، ئیدی نەك هەر یارمەتی میرنشینی بابانیان نەدا بە لكو دوژمنایەتیشیان دەكردن .

4 - ئەو بزوتنەوە «ئیسلامی» یەی سوڵتانی عوسمانی مەحموودی دووەم ساڵی [1808 - 1839] پێی هەڵسا بووە هۆی ئەوەی دەست بەسەر هەندێ ناوچەدا بگرێ كە سەر بە ئەمارەتی بابان بوو .. بەمەش سنووری ئەمارەتەكە تەسك و لاواز بوو .

5 - سەرهەڵدانی بنەماڵەی دینی بەرزنجی‌و بەربەرەكانی ئەمیرە بابانەكان بوە هۆی لاوازی حوكمی بابانەكان] .

**- قووتدانی ئەمارەتی بابان -**

ماموستای موحازیر سەبارەت بەپێچانەوەی دوا لاپەرەی تەمەنی ژیانی ئەمارەتی بابان ، هۆشیارانە ئەو «وەسیقە» مێژوویە یەك والاكردوەوە كە ئەمارەتەكەی پێ هەڵوەشێنرایەوەو وتی :

[ساڵی 1851 لەلایەن والی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی نامق پاشاوە ئەمری هەڵوەشانەوەی میرنشینی بابانی دەركردو لە جیاتی ئەو كاربەدەستێكی عوسمانی لە سلیمانی دانا ..]

هەروەها برای موحازیر لەم رووەوە وتی :

[ئابەوشێوەیە پەردە بەسەر دواتەمەنی مێژووی ئەمارەتیكی كوردی لەكوردستانداو لە چەرخی نۆزدەهەمدا دادرایەوە !!!] .

شایانی باسە ماموستای موحازیر شارەزایانە لەبابەتەكەی كۆڵیەوە كەبریتی یە لە [ئوتروحەی ماستەر] كە لە زانكۆی بەغا گفت‌وگۆی لەسەركردوەو بەباشی تێدا سەركەوتووە .

**- كورتەی ژیانی ماموستا [عبد ربه سكران إبراهیم] -**

+ ساڵی 1946 لەگەرەكی جەعفەری‌یە لە شاری كوت لەدایك بووە .

+ قوتابخانەی سەرەتایی‌و ناوەندیی‌و ئامادەیی هەرلە شاری كوت تەواوكردوە .

+ ساڵی 1971 لە كۆلێژی ئاداب بەشی‌مێژو لەزانكۆی بەغدا دەرچووە .

+ ساڵی 1973 لە كۆلیژی پەروەردە لەزانكۆی بەغدا بڕوانامەی [دبلوم مهني العالي] وەرگرتووە .

+ بڕوانامەی ماستەرەكەی لەزانكۆی قاهرە وەرگرتوە ، بەناوی : [مێژووی ئەمارەتی بابانی كوردی] .

+ ئێستاش بەنیازە بڕوانامەی دكتورا لە مێژوی كوردا بەم ناونیشانە وەدەست بهێنێ : [لێكۆڵینەوە لە باری كۆمەلایەتی‌و ئابووری‌و رامیاری كوردی عیراق لەچەرخی نوزدەهەمدا] .

---

# لە سلێمانی

**- ئاسۆس - ئامادەی كردووە**

**« پیشانگایەكی زانستی »**

مەڵبەندی چاودێری زانیاری سەر بە ئەمانەتی گشتی رۆشنبیری‌و لاوان لە سەرەتای مانگی نیساندا پیشانگایەكی زانستی رێكخست ، وەك ئاشكرایە ئامانجی سەرەكی هەموو پیشانگایەكی ساڵانەی دەزگا زانستیەكان دەرخستنی رووی ئەو چالاكییانەیە كە لە ماوەی ئەو ساڵەدا كارمەندانی ئەو





یاری .. سالی ... شاری سلێمانی ...

دەزگایە بە ئەنجامیان گەیاندووە ، جگە لە خۆش‌کردنی زەمینەیەکی باش بۆ قسەو گفتوگۆ کردن لەنێوان بینەراندا ، دیارە ئەمەش لە خۆیدا دەبێتە شلەقاندنی گۆمی پەنگ خواردووی زانستی لەوبوارەدا لەگەڵ و ڕوژاندنی کۆمەڵێک ڕاو سەرنج و بۆ چوونی نوێ .

ئەم پیشانگایەش تارادەیەکی باش ئەو ئامانجەی دەست نیشان کردبوو ، لەماوەی ئەو هەفتەیەدا ژمارەیەکی زۆر لە خەڵکی ڕۆشنبیری تێدا کۆبوەوە بەتایبەتی قوتابیان و مامۆستایانی ناوەندی و ئامادەییەکان جگە لە بەپەرۆشەکانی زانست .

پیشانگاکە زوربەی بەدەستی قوتابیان و سەر پەرشتی کارانی بەشەکانی مەڵبەندەکە هێنرابوە بەر ، بریتی بوو لە نۆ بابەت کیمیا ، جیولۆجی ، ژیانزانی ، فیزیك ، ئەلەکترۆن ، کارەبا ، وێنەگری ، میکانیك ، فڕین .

لەو چالاکیانە لە لقی کیمیا دا پیشان درا بوو :

ئامێری پاك کردنەوەی خوێ ، دروستکردنی شامپۆ ، گۆڕینی ووزەی کیمیاوی بۆ جوولەووزە ، دروستکردنی وێسکی خۆماڵی ، نەهێڵی تەم لەسەر شووشە .. تا .. د .

لە فیزیکدا : ئامێری پاسەوانی دەرگا ، ساردکردنەوەو گەرم کردنەوە ، تەلگراف ، تیشکە موسیقا .

لەژیانزانیدا : کێڵگەی خشوك ، ئۆزموزیەتی پەتاتە ، چرەدارستان ، کۆرپەلەی بربرە دارەکان ، مۆمیای گەلێك گیانەوەر .

لە جیولۆجیدا : تابلۆی ڕوونکردنەوە دەربارەی بەردە ئاگرینەکان ، نەخشەی پێنجوێن کە بەردەسەرو تفتەکان نیشان دەدات ، هەندێ پارچە بەردی بورکانی ، توێکڵی کیشوەرو زەریاکان .

لە ئەلەکترۆندا : ئامێری تایمەری ئەلەکترۆنی 30 سویچ ، ئامێری وشك کردنەوەی قوماشی تەڕ (ئوتوماتیك) ، ئامێری گۆڕینی ووزەی خۆر بۆ ووزەی کارەبا ، ئامێری هێلکاری دڵ ، گۆڕینی دەنگ بۆ تیشك جگە لەمانە گەلێك چالاکی تر لە

میکانیك و فڕناسیدا پیشان درا بوو ئەوە شمان لەیاد بێ کە بەشی وێنە گرتن نزیکەی (65) وێنەی شاری سلێمانی بە بۆنەی تێپەڕ بوونی 200 ساڵ بە سەر دامەزراندنی ئەم شارەدا پیشان دابوو کە هەندێکیان بۆ 40 ساڵ لەمەو بەر دەگەڕانەوە . مامۆستا ئەکرەم قەرەداخی ، مامۆستای بایولوجی لەدوا ناوەندی هەڵکەوت سەرەڕای ئەو سەرنجە وردانەی هەیبو بەرامبەر پیشانگاکە وتی پیشانگاکە باش و بەسوودو سەرکەوتوو بوو ، توانیویەتی جموجوڵێکی چاکی زانستی دروست بکات لەگەڵ پیرۆزباییما بۆ مامۆستایان و قوتابیانی خاوەن بەرهەمەکان پێشنیاز دەکەم ئەو وێنانە لە نامیلکەیەکدا چاپ بکەن و بڵاوی بکەنەوە لەژێر ناوی (سلێمانی لەوێنەدا) تاوەك ئەرشیفێکی وێنەی ئەم شارە بمێنێتەوە .

## باری ڕۆشنبیری لە سەردەمی بابانەکاندا

ئێوارەی 11 / 4 / 1984 دەزگای ڕۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی کۆڕێکی لە هۆڵی کارگەی جگەرە سازکرد ، تیایدا مامۆستا محمود احمد محمد ئەمینداری نامەخانەی گشتی ئەوقاف لە سلێمانی باسێکی بەپێزی دەربارەی « باری ڕۆشنبیری لە سەردەمی بابانەکاندا » پێشکەش کرد ، ئەدیبی زمانەوان مامۆستا ڕەؤف ئەحمەد ئالانی دەربارەی ئەم باسە لەکۆتاییدا ووتی :

« مامۆستا محمود وەك سەرەتایەك لەجزیرەو بۆتانەوە کاروانە ڕوشنبیریەکەی بەڕێ خست ، بەلام من لێی زیاد دەکەم و دەڵێم : هەر لەسەرینی سەلاحەدینداو بە سەر پەرشتی لیژنەیەکی بیر تەسکی سۆفی مەشرەب بەدەیان هەزار کتێبی دەستنووسی پاشماوەی دەوڵەتی دۆستەکی کوردی موسڵمانیان سووتاند ، گوایە ئەوانە کتێبی (زەندەقەو مەندەقەن) بۆ نزیکتر ئاور دەدەمەوە ئەوەش ئەولیا چەلەبی ی تورك و خاسە پیاوی حەرەمی عوسمانییان کە لەگەڵ مەلیك ئەحمەد شای والی (وان) دا هێرشیان بردە سەر میر ئەبدال خانی بتلیس کە شتومەك و کتێبخانەکەی ئەو میرەیان هەڕاج کرد ، چەلەبی دەڵێ : دوای سووتاندنی هەزاران کتێب و دیوانە شیعری کوردی باری حەوت ووشترمان لێ بار کردن .. تەنانەت میر ئابدال (70) دانان و دەستنووسی خۆی هەبوە . ئەمجا مامۆستا ئالانی

وتی : ئەگەر بمانەوێ بنیاد بۆ مێژووی گەلەکەمان دابنێین ، پێویستە بە هەرەوەز پاشماوەی ئەو خوێندنگا ئاینیانە بپشکنین و هەموو کەلەپوریکمان چەندی بەبەرەوە مابێ کۆی بکەینەوە ، تۆمار کردنی بیرەوەری کەسانی شارەزاو کۆنە سال کاریکی پێویستە . بەم بۆنەیەوە کارەکەی مامۆستا محمود احمد زۆرچاك و بەجێیە .

بۆ دۆزینەوەی بەڵگە نامەو هونەری بیناسازی و شوێنەوارو تۆمار کردنی بیرەوەری بە سالاچوەکاندا کاری پڕ سوودی مامۆستا عبدالرقیب یوسف لەبەر چاوەو بە خێرو بێرە .
هەروەها سەبارەت بەم باسە تازە بە کەڵکەی مامۆستا محمود وتی : مامۆستای خاوەن باس لەم بوارەدا شوێن پەنجەی دیارەو لەکتێبە چاپکراوەکەیدا (فهرس المخطوطات) گەلێ هەڵەی بۆ مێژوو ناسەکانیش ڕاست کردۆتەوە بۆ نمونە مامۆستا سالم عبدالرزاق دەڵێ : محمد ابن الحاج خەڵکی بەسرایەو بۆ سالی 1180 دەگەڕێتەوە ، ڕاستیەکەشی ئەوەیە کە مامۆستا محمود دەیلێ : ابن الحاج ناوی محمدی حاجی حسنەو کابرایەکی کوردەو سالی مردنیشی 1200 ی کۆچییە .
مامۆستا ئالانی دەربارەی هەڵسەنگاندنی باسە مێژووییەکەی مامۆستا محود احمد وتی : هەر زانستێك و هەر هونەرێك و هەر فەلسەفەیەك کە لەنێو گەلە دەسەلاتدارەکانی دراو سیمانا باو بوو بێ ، بەشێوەیەکی ئەکادیمیانە لەمیرنشینێك و میرەدێیەکەوە تا کوێخادێیەك و کوێرەدێیەکی هەژار هەولیان بۆ داوەو قوزتویانەتەوە ، لەڕووی دانان و نووسینەوەو لێکۆڵینەوەو پەراوێز لێدان و گوتنەوەدا هەر لەزانینەکانی گەردووناسی و مەنتیقەوە تادەگاتە ڕەوانبێژی و شەریعەت و ئەدەبیات ، بە هەزاران داناو زانای کورد نەژاد خۆیان تێدا تواندووەتەوە .
کوێرەدێیەکی سەر سنووری وەك (سنجوێ) کە (ابن الحاج) ی لێ هەڵکەوتوەو مامۆستای شێخ مارفی نۆدێی بووە ، یان چەند کۆخێکی دوورە دەستی دوور لە شارستانیی باو ، وێنەی مەلا عەبدوللای بێتوشی لێ هەڵکەوتوە ... یان (نالی) خاك و خۆڵەکەی شارەزوورو ـ خانا ـ ی نێو شاخەکانی هەوارمان و تا ... د ئەگەر بەو چەپەکیەوە کوردنشین نەبوونایەو گەلێکی دیکەی تێدا بژیایە لەوانەبوو زەلامەکانی هەر مالییش نەبن .
لە کۆتاییدا ئالانی بەم فەرمودەیەی نالی کۆتایی بەسەرنجەکانی هێنا



« شکاری وەحشییان بەس دەستە مۆکەن »
« نەوەك بەربێ شکاری خانەزاتان »

شیاوی باسەکە ئەم باسەی مامۆستا محمود باسێکی گرنگ و بەپێزبوو پشتی بەگەلێك سەرچاوەی وا بەستبوو کە زوربەیان بە دەگمەن وەدەست دەکەون ، بۆ ئەوەی خوێنەرانمان زیاتر لێی سوودمەند بین هیوامان وایە بەزووترین کات مامۆستا محمود یان لە گۆڤارێکدا یان لە نامیلکەیەکدا بە چاپی بگەیەنێ . لەسەرەتای ئەم کۆڕەدا کاك فریا جاف نوێنەری دەزگای ڕۆشنبیری وبلاو کردنەوەی کوردی ووتارێکی خوێندەوە ، پەنجەی بۆ چالاکییەکانی دەزگاکەیان لەبواری ڕۆشنبیریدا ڕاکێشا ، هەروەها ئەم کۆڕەشی بەسەرەتای دەست پێکردنی وەرزێکی نوێی ڕۆشنبیری دەزگاکەیان لە سلێمانی پیشاندا .

## پەیمانگەی هونەرە جوانەکانی سلێمانی و شانۆو پیشانگا

پەیمانگەی هونەرە جوانەکان لە سلێمانی سالی 1980 دامەزرا ئەو مامۆستا هونەرمەندانەی لە دامەزراندن و گەشە پێکردنیا لە یەکەم سالیدا بەشدار بوون ئەمانە بوون :
عەلی جۆلاو کوردو حەمە عەلی و بەختیار مستەفاو هیوا عەبدوللاو حیکمەت هیندی و عەبدوللا رەسول و بەدیعە دارتاش و ئازاد جەلال . ڤیستڤالی یەکەمی پەیمانگە سالی 1982 لە هۆلی قوتابخانەی گۆیژەی کچان کرایەوە ، دووەمیان لە سالی 1983 لە هۆلی پەیمانگە کرایەوە [ ئەوە بوو لە گۆشەی کاروانی ڕۆشنبیریدا لەم گۆڤارەدا بایەخێکی باشمان پێدا ] . یەکەم

جار لقەکانی بەشی تەشکیلی [ نیگارکێشان ، پەیکەر تاشی ، گۆزەکەری (سیرامیك) کرابوونەوە ، بەلام بەشەکانی ئێستای پەیمانگە بریتین لەمانەی خوارەوە :

1 – **بەشی تەشکیلی ئەویش سێ لقە : نیگار کێشان ، پەیکەر تاشی ، گۆزەکەری .**
2 – **بەشی شانۆ**
3 – **بەشی مۆسیقا**

ژمارەی قوتابیانی پەیمانگە بە تەنیا لەبەشی تەشکیلیدا (221) قوتابین لەوانە (81) کچیان تێدایە .

ئەم سالیش بۆ ماوەی چەند رۆژێك لە 24/4/1984 دا سێیەم پیشانگای هونەری تەشکیلی کرایەوە کە بریتی بوو لەبەر هەمی نیگارو پەیکەر تاشی و سیرامیك .

هیوامان وایە پەیمانگە هەر لەگەشە کردندا بێ و مامۆستاو قوتابیەکانیشی هەردەم سەرکەوتووبن و بەردەوام بن لە خزمەتی هونەری کوردیدا

## شانۆنامەی (هاملێت) لەپەیمانگەی هونەرە جوانەکانی سلێمانیدا

لەشاکارەکانی شکسپیرو وەرگێرانی یاسین قادر بەرزنجی و دەرهێنانی ئەحمەد سالار (32) قوتابی پەیمانگە لە 22/4 تا 25/4/1984 شانۆنامەی هاملێتیان پێشکەش کرد ، شیاوی باس کردنە بەشی شانۆ لەم پەیمانگەیەدا لە سالی 1982 ئەڤیگێنیا لە ئولیس / ی پێشکەش کرد لەنووسینی یوربیدس و وەرگێران ودەر-هێنانی ئەحمەد سالار لەسالی 1983 دا یولیوس سیزەری شکسپیر پێشکەش کرا لە گۆرینی حەمە رەشید هەرەس و



دەرهێنانی بەدیعە دراتاش .

سەبارەت بەم بەرهەمە تازەیەی پەیمانگە دەرهێنەری شانۆ نامەکە مامۆستا ئەحمەد سالار دەلێ : « هەبوو نەبوو .. رەشەبایەکی کوێر شەوێکی تاری بەهەل زانی و بەگژ بێستوونێکی ئەستێرە لەکۆلدا چوو ، چەند گیفە گیفی هەرەشەی کرد بەلام بەبێ کەلەشێریش خۆر لەناوچەوانی چیاکەوە هەلهات و بەهەلهاتنی وەیشوومەکە پێکەنی .. منی کوردە دەرهێنەریش وەك ئەو سەودا سەرە سەر سەختەی کە گشت سەرماو سولەیەکی رەق کەرەوەی بەزاندن نەیتوانی وانەی قالبوونی نێو سەهۆل بەندانی بێ بدۆرێنی ، چونکە دۆزەخ و سەهۆل بەندانی ژێر پێ ناو ئاسمانی نەورۆزی بروای بەحەبیبە گەیشتنی نالیانەی لەبۆتەی بووندا داگیر ساندبوو .

هەر کۆششێك لەپای دلنیاییدا بێ شایانی رێزو ستایشە ، (هاملیت) یش سەرکردایەتی هێرشێکی پێویستە بۆ راستکردنەوە . لەتاقیکردنەوەی هەمونیمدا بە (هەم) بردیەوەو ناکامی دلنیایی چنگ کەوت » .

دیکۆری شانۆنامەکە هونەرمەند مامۆستا عەلی جۆلا ئامادەی کردبوو مامۆستا کەمال هەنجیرەیی یاریدەری بوو ، پۆستەرو ئارایشتیش مامۆستا حیکمەت هیندی ، کاك هیوا عەزیز یاریدەری دەرهێنەر بوو .

## « خەلاتی پیشانگەی ئەتاتۆرك و پیشانگەی ئیسلامی »

لەمانگی نیسانی سالی 1983 دا قوتابیانی قوتابخانەی (بۆتان) لەسەرچنار پیشانگایەکی رێك و پێکیان پیشاندا ئەوە بوو لەم گۆڤارە دا بۆ یەکەم جار لەراپۆرتی رۆشنبیریدا باسمان کردو بایەخێکی باشمان پێدا ، لەئەنجاما کە ئەو پیشانگایە برا بۆ بەغدا بوە مایەی سەرنج راکێشانی بینەران و زۆربەی گۆڤارو رۆژنامەکان لەسەریان نووسی ، والەم رۆژانەدا لەرێگای بەرێوەبەرێتی گشتی پەروەردەوە زانرا کە دوو قوتابی ئەم قوتابخانەیە تابلۆکانیان لەپیشانگای ئەتاتورکی دەولی و پیشانگای ئیسلامیدا خەلات کراون ، ئەو دووقوتابیەش (نەورۆز جەلال و فریاد ئەحمەد) ن پیرۆزبابیمان بۆ قوتابیان و مامۆستایانی قوتابخانەی بۆتان بەتایبەتی هونەرمەند نوری ئیسماعیل مامۆستای هونەری قوتابخانەکە .

